لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد



# وشە سازی لە زمانی کوردیدا

فارۆق عومەر صدیق

لە بەشی دوەی بەرگی سێیەمی
« گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد »
دەرهێنراوە

چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد - بەغدا
١٩٧٥

# وشە سازی لە زمانی کوردیدا

فاروق عومەر صدیق

[ ڕوون کردنەوەیێک لەلایەن نرخێنەری گوتارەوە:

لە کاتی خۆیدا کە ئەم گوتارەمان بۆ هات ، لە گەڵ ئەودا نامەیێکیش بۆ خۆم هات لە لایەن خاوەن گوتارەکەوە خواهشتی لێم کردبوو کە هەوڵ بدەم گوتارەکەی بۆ بڵاو بکرێتەوە لە گۆڤاری کۆڕ وەیا لە گۆڤارێکی تری کوردیدا . کە گوتارەکەم خستە بەر چاوی ئەندامانی ئەنجومەنی کۆڕ بڕیاریان دا بۆ نرخاندنی هەر بەمن بدرێتەوە ... کە دیتم تێبینیەکانم درێژەی کێشا گوتارەکەم بردەوە بەر دەستی ئەنجومەنی کۆڕ : لە پێشەوە ئەنجومەن بۆئەوە چوو داوا لە نووسەری گوتارەکە بکرێ کە لەبەر تیشکی تێبینیەکانی من دەسکاری گوتارەکەی بکات ئەوجا بۆی بڵاو بکرێتەوە . بەڵام من پێشنیارم کرد نووسەر خۆی سەربەشك بێ بۆ پەسند کردنی یەکێك لە دوو ڕێبازان : یا گوتارەکە بخاتە بەر ڕۆشنایی ڕەخنەکانەوە و دەسکاری تێدا بکا بە ئەندازەی ڕازی بوونی خۆی لە ڕەخنەکان .. یاخود

گوتارەکەی وەك خۆی بێدەسکاری بڵاو بکرێتەوە و لە گەڵ ئەویشدا بێ بە پێ و جێ بە جێ رەخنەکان تۆمار بکرێن . لەم پێشنیارەمدا رەچاوی ئەوەم کرد کە رەنگە لە هەندێك وەیا زۆری رەخنەکان من بەسەهو چوبم وێڕای ئەوە کە نابێ بیروباوەڕی من بەسەر نوسەردا بسەپێ . ئەنجومەن ئەم پێشنیارەی لێ سەلماندم و منیش چۆنیەتی هەڵوەستم بۆ خاوەن گوتار نوسی تا دڵخوازی خۆی دەرببڕێ . لە وەرامدا وای پەسند کرد دەست لە گوتارەکەی نەدرێت ، رەخنەش کە هەبی لەگەڵیدا بڵاو بکرێتەوە . ئەمەی لەم شێوە بڵاوکردنەوەی گوتارەکەدا دێتە بەر چاوی خوێنەر ، کە تائێستا لە لایەن چ گۆڤارێکەوە پێڕەوی نەکراوە ، خواهشتی خاوەنەکەیەتی کەوا بەکجار دیموکراتانە کۆڕ لەویش و لەمنیشی سەلماند ، ئەرك و زەحمەتێکی بەسەر منیشدا شکایەوە لە بڵاو کردنەوەی گوتارەکەدا و پتر لە نوسینی گوتارێك خەریك و ماندوی کردم ، مزەی گیانی هاریکاری و ریزلەیەکترنان بێ کە هەمو نوسەران و خوێنەرانی کورد دەبێ بیکەن بە شێوازی رەفتار و کردار لەم پێنج و دو رۆژەی بەیەکەوە ژیاندا .

ئەم چەند دێڕەی لێرەش بەدواوە دێت دەقی پێشەکی نرخاندن و رەخنە گرتنە لەم گوتارە کە لە کۆبونەوەی ئەنجومەنی کۆڕدا لەلایەن نرخێنەرەوە خرایە بەر چاو . رەخنەکان راستەرخۆ بەدوا ئەم پێشەکیەدا دەهاتن لەگەڵ ئیشارە بۆ ئەو روپەڕەیەی گوتارەکە کە

مادەی رەخنە لێ‌گیراوی تێـــدا نوسراوە . لێرەدا سەرلەنوێ دەبێ شریتەی رەخنەکان هەڵوەشێنەوە و هەر یەکەیان بخرێتە ئەو جێگەیە کە رەخنـــەی لێ‌گیراوە ، ئەگەر وام نەکردبا سەرم لە خوێنـــەر دەشێواند . جگە لە سەر لێ شێواندن لە لایەنێکی‌تریشـەوە سـودی رەخنەکان کەم دەبۆوە کە ئـــەویش لایەنی یەك نەگرتنەوەی تسلسلی ژمارەی رۆپەڕەکانی گوتارەکەیە لەگەڵ رۆپەڕەکانی گوڤارەکە کە بـەر گوتارەکە دەکەوێ : مـن کە گوتم لە لاپەڕەی چوارەمی گوتارەکە فلانە شت نوسراوە چ رێـگەیێکی ئاشکرام نەخسـتە بەر هەنـگاوی خوێنەر چونکە لەوانەیە لاپەڕە چواری گوتارەکە بـەر لاپەڕە چوار سەد و پەنجای گۆڤارەکە کەوتبێ . هـەر خۆم دەشزانم ئـەم دوجار نوسینەوە و دابەش کردنەی سەرلەنوێ چەندی ماندو کردوم .

ئەمە پێشەکیەکەیە :

« بۆ ئەنجومەنی کۆڕی زانیاری کوردی بەریز »

« لەســەر خواهشتتان بەوردی گوتارەکەی ( کاك فاروق عمر »
« صدیق )م خوێندەوە کە لەسەر بەکار هێنانی دو پاشگری ئاخاوتنی »
« کوردی نوسیوە : یەکێـکیان پاشـــگری (ی) ناوی واتا و »
« ئەوی‌تریشیان (ی) نیسبەت . »

« من ئەمە جاری دوەمە گوتارەکە دەخوێنمـەوە . لە ئەنجامی »
« خوێندنەوەی جاری یەکەمدا چەند تێبینیەکم هەبون لە بارەی ئەو »
« رەخنانەی کە خاوەن گوتار لە هەندێ بیروباوەڕی خۆی گرتبو ، »

« بەنامە بۆم نارد و پێویست نابینم لێرەدا جارێکیتر باسیان بکەمەوە »
« بەتایبەتی لەو ترسەی نەوەك گومان بڕوا بۆ ئەوە کە دەمــــەوێ »
« بیرەباوەڕەکانی خۆمی بەسەردا بسەپێنم چونکە بە عادەت بیروڕای »
« ( پســپۆڕ ) بەسەر گوتارەکەدا دەسەپێ . دیارە کە من خــۆم »
« پسپۆڕەکەیم رەوا نابینم ئەم صفەتەی پسپۆڕیم بکەمە هـۆی پەك »
« خستنی بیروڕای یەکێکیتر کە دژی هی من بێت . »

پێشەکیەکە کۆتایی‌هات .

لەمە پاش رەخنەکان دەست پێ‌دەکەن پێ بە پێی جێگەی خۆیان لەگوتارەکەدا .

نرخێنەری گوتار
مەسعود محەمەد

١ـ سوفیکسی ناوی ئەبستراکتی(*) ( ی ٔ )
٢ـ سوفیکسی سیفەتی نیسبی ( ی ٔ )

(*) ( ئەبستراکت ) لە وشەی ( ئەبستراکتۆ )ی لاتینییەوە وەرگیراوە کە بریتییە لە بیرێــك یاخود مەفهوومێك بە جــودا لە کەسێــکەوە یاخود لە شتێــکی دیاری کراوەوە وەرگیراوە وە هەر لەم وشەیەشەوە زاراوی ( ناوی ئەبستراکتی ) وەرگیراوە و بە شێوەیەکی گشتی لە زۆر زمانە جیهانیەکاندا بەکار دێت جا لەبەر ئەوە ئێمەش هەر ئەم زاراوەیەمان بەکار هێنــا چونــکە جیهانیترە و راسترە لە زاراوی ( اسم معنی ) کە تا ئێستا بۆ ئەم مەبەستە بەکار هاتووە .

[ ڕەخنە :

ناونیشانی گوتارەکە گەلێك بەرفرەوانترە لە ناوەرۆکی. ڕەنگە وا باش بێ بگوترێ « ڕێبازێکی وشەسازی لە زمانی کوردیدا » وەیا هەرشتێکیتری وەك ئەم کە خاوەنگوتار پێی ڕازی بێت .

ڕەخنەگر ]

= ناوی ئەبستراکتی : بەو وشەیە دەوترێت کە بریتییە لە بیرێك یاخود مەفهومێك وە دەلالەت لە خاسیەتی یا حاڵەتی یاخود جۆری کەسێك یان شتێك یاخود ناوی کارێك دەکات کە نەدەتوانرێ ببینرێت یاخود دەستی لێ بدرێت یا بۆنی بکرێت وەك : جوانی ، باخەوانی ، ئازایی .. هتد بە پێچەوانەی ناوەکانیتر کە دەلالەت لە شتێك یاخود کەسێك دەکەن کە دەتوانرێ ببینرێت یا دەستی لێ بدرێت یان بونی بکرێت وەك : جوان ، باخەوان ، ئازا ، دار ، بەرد .. هتد هەروەها ناوی ئەبستراکتی مانایەکی گشتی دەبەخشێت بۆ نمونە کە دەڵێین ( باخەوان ) لەوانەیە مەبەستمان یەك باخەوان بێت ، بەڵام ( باخەوانی ) مانایەکی گشتی دەبەخشێت کە بریتییە لە ناوی کاری هەمو باخەوانێك نەك تەنها باخەوانێك .

[ ڕەخنە :

شیکردنەوەی واتای ئەبستراکت لەم پەراوێزەدا درێژەی هەیە ، لە وە دەچێ بۆ قوتابی سەرەتای خوێندنی زمان ناسی نوسرابێ . بەلای منەوە ئەوە بەسە بگوترێ وشەکە لە فلانە سەرچاوەوە هاتوە و بە پێی بیروڕای خاوەن گوتار لە ئیسمی مەعنا ڕاسترو جیهانیترە .

هەر لە بارەی ئەم وشەیەوە دەبێ ڕەچاو بکرێ کە دروست نیە بگوترێ (ناوی ئەبستراکتی) چونکە جێگەی هێنانە ناوی واتای نیسبەتی تێدا نابێتەوە لەو ڕووەوە کە ( Abstract ) خۆی وشەیێکی وەصفیە بەواتای=

وشـە سازی بە یارمەتی سوفیکس ، یەکێکە لە ڕێگەکانی وشەسازی لە زمانی کوردی و لە هەمو زمانە ئێرانیەکانیتردا . لە زمانی کوردیدا هەتائێستا کۆمەڵێکی زۆر لە وشەی جودا جودا بە یارمەتی سوفیکس دروست کراوە و دروسـت دەکرێت . ئاشکرایە لە زمانی کوردیدا وەك لە هەمو زمانەئێرانیـکانیتردا ، کۆمەڵێکی یەکجار زۆر سوفیکس هـەیە ، کە هەریەکێکیان تەبیعەتێکی تایبـــەتی هەیە و ڕۆڵێـکی تایبـــەتی لە مەیدانی وشـــەسازیدا دەبینێت . هەروەها هەریەکێك لەو سوفیکسانە ئەسڵی خۆی هەیە و مانای تایبـــەتی دەبەخشێت ، کە بەمە لە سوفیکسەکانیتر جودا دەکرێتەوە ، واتە ئەگەر بێتو دیراسەیەکی مێژوویی ئەو سوفیکسانە بکرێت ، دەبینین کە هـەر سوفیکسێك لەو سوفیکسانە سوفیکسێـکی سەربەخۆیە و بە درێژایی کات و پێویستی زیان هاتۆتە کایەوە و کاتی خۆی وشەیەکی سەربەخۆ بوە و مانایەکی تایبەتی بەخشیوە ، بەڵام بە گوێرەی گۆڕانی

= ( مەعنـــەوی ) . بەرانبـــەرەکەشی کە ( Material )ە ئەویش وەصفییە بە واتای ( مادی ) . راستی زاراوە کە ( ناوی ئەبستراکت )ە . گەلێك وشەیتر وەك ئەمەیان بەسەر زمان و خامەی نوسەرانی کورددا پاشگری نیسبەتی پێوە دەنوسێ و ج جێشی نیە وەك کە دەڵێن ( ئەریستۆکراتی ، دیمۆکراتی ، بیرۆکراتی .. ) . ئەم بەکار هێنانە عەرەبییە نەك کوردی . لە کوردیدا دەبێ بڵێین ( پارتی دیمۆکرات ، پیاوی ئەریستۆکرات .. ) . کە بڵێین ( دیمۆکراتی ) واتاکەی دەبێتـە ( Democratic ) ، بە پێی دەستوری وشە سازی لە کوردیدا .

نرخێنەر ]

زمان و بەرەو پێش چوونی بە پێی کات و پێویستی ژیان گۆڕانیش بە سەر ئەمدا هاتوە و ئەو رۆڵەی جاران لە زماندا دەیبینی ، پاش ئەو گۆڕانە نەماوە و رۆڵێکی تری لە زماندا بینیوە کە ئەویش ئەوەیە بوە بە سوفیکس و چوّتە پاڵ جۆرەها وشەی جیاواز جیـــاواز و ئەو مەعنایەی کاتی خۆی وەك وشەیەکی سەربەخۆ بەخشیویّتی داوە بەو وشانەی کە چوّتە پاڵیان . هەروەها گۆڕانی زمان و بەرەوپێـش چوونی بە پێـی بەرەوپێشچوونی ژیانی ئادەمیزاد ، بوە بە هۆی ئەوەی کە هەندێك لەو سوفیکسانە چ لە رووی مەعناوە و چ لە رووی فۆرمەوە گۆڕانیان بەسەردا بێت .

بۆ ئەوەی مێژووی هەر سوفیکسێك و ئەسـڵی و ئەو رۆڵەی کە لە مەیدانی وشە ســـازیی لە زمانی کوردیدا دەیبینێت بزانین ، پێویستمان بە دیراسەیەکی زانستی ومێژوویی ئەو سوفیکسە هەیە بەڵام نەك تەنها لە زمانـی کوردیدا ، بەڵـکوو بە شێوەیەکی گشتی لە زمانە ئێرانیێـکانی تریشدا . لەگەڵ ئەوەدا کە لە هـــەر زمانێـك لە زمانە ئێرانیێـکان کۆمەڵێك سوفیکس هەیە کە تایبەتییە تەنها بەو زمانەوە و موڵـکی ئەو زمانەیە و لە زمانە ئێرانیێـکانی تردا نییـە ، بـەڵام لە هەموو زمانە ئێرانیێـکاندا کۆمەڵێك سوفیکس هەیـــە کە تێـکڕا موڵـکی ئەو زمانانە هەموویانن ، واتە لە هەمـوو زمانە ئێرانیێـکاندا هاوبەشن و یەك ئەسڵیان هەیە و بە شێوەیەکی گشتی لە هەموویانـدا یەك مەعنا دەبەخشن و یەك رۆڵ لە مەیدانی وشەسازیدا دەبینن .

زمانەوانانی کورد هەتا ئێستا تا رادەیەکی باش و سەرکەوتو و سودبەخش لەگەڵ کارە زمانەوانیێکانی تریانـــدا ، لە سوفیکسەکانی زمانی کوردی کۆڵیونەتەوە و باسیان کردوە بە تایبەتی مامۆستایان (سەعید سدقی کابان ، تۆفیق وەهبی ، نوری عەلی ئەمین) هەروەها لە یەکێتی سوڤێت لە لایەن مامۆستایان (پرۆفیسۆر کوردۆیێف و پرۆفیسۆر باکایێف و کەریمی ئەیوبی و سەمیرنۆڤا)وە باسی سوفیکسەکانی زمانی کوردی کراوە و لیێان کۆڵراوەتەوە .

بە گشتی ئەو زمانەوانانەی کە تا ئێستا باسی سوفیکسیان لـە زمانی کوردیدا کردوە ، هەموویان تێکرا باســەکانیان لە باسێکی مێژوی ئەو سوفیکسانەوە دور بوە ، ئەگەرچی زانایانی کوردی یەکێتی سوڤێت لەم مەیدانەدا گەلێ هەنگاوی گەورەیان ناوە ، بەڵام ئەمانیش بە شێوەیەکی گشتی نەهاتون دیراسەیەکی مێژوی قوڵی سوفیکسەکانی زمانی کوردی وەك دیراسەیەکی سەربەخۆ بکەن .

ئەم قسەیەمان بە هیچ جۆرێك ئەوە ناگەیەنێت کە گوایە زمانەوانانی کورد تا ئێستا لە دیراسە کردنی سوفیکسەکانـدا سەرکەوتو نین ، بەڵکو بە پێچەوانەوە زمانەوانانی کورد بەپێی توانای خۆیان بە تایبەتی زمانەوانانی یەکێتی سوڤێت گەورەترین هەوڵ و تەقەلایان لەم مەیدانەدا داوە و بە شێوەیەکی زانستیانە لە سوفیکسەکانی زمانی کوردی کۆڵیونەتەوە ، تەنها ئەوە هەیە کە هەمویان بە

تێکڕایی نەهاتوون بە شێوەیەکی سەربەخۆ باسی هەر سوفیکسێك و دیراسەیەکی مێژوویی ئەو سوفیکسە بکەن و لەگەڵ زمانە ئێرانیەکۆن و تازەکاندا بەراوردی بکەن و ئەو رۆڵەی هەر سوفیکسێك لە مەیدانی وشەسازیی لەزمانی کوردیـدا دەیبینێ بە تەواوی رۆنی بـکەنەوە و ئاشکرای بکەن .

دیراسە نەکردنی مێژوویی سوفیکسەکانی زمانی کوردی ، وای لە زمانەوانەکانمان کردوە کە هەندێ جار (لەگەڵ ئەوپەڕی ڕێزمانـــدا بۆیان) لە باس کردنی سوفیکسەکانی زمانی کوردیدا بکەونە هەڵەوە ، بەتایبەتی لە جوداکردنەوەی سوفیکسێك لە سوفیکسێکی تر ، یاخــود لە شی‌کردنەوەی مانـا و تەبیعـەتی تایبەتی هـــەر سوفیکسێك لەو سوفیکسانە و نەدۆزینەوە و ساغ نەکردنەوەی ئەسڵی سوفیکسەکان و تێکەڵ کردنی سوفیکسێك لەگەڵ سـوفیکسێکی‌تردا . بۆ نمـونە وەك تێـکەڵ کردنی سوفیکسی ناوی ئەبستراکتی (ی ا) لەگەڵ سوفیکسی سیفەتی نیسبی (ی ا)دا .

ئێمە لەم کارەماندا هەوڵ دەدەین کە دیراسەیەکی مێژوویی ئـەو دوو سوفیـکسە ، واتـــە سوفیکسی ناوی ئەبستراکتی (ی) لەگەڵ سوفیکسی سیفەتی نیسبی (ی) بە شێوەیەکی زانستی و قــووڵ و مێـــژوویی لە زمانی کوردیدا بکەین و بەراوردی لەگەڵ زمانـــە ئێرانیەکۆن و تازەکاندا بکەین .

لەیەك چوونی فۆرمی (شکل) ئەم دوو سوفیکسە وای لە زوربەی

زمانەوانان کردوە کە بە شێوەیەکی گشتی بە یـــەك سوفیکسیان لە قەڵەم بـــدەن ، واتە سوفیکسی (ی) کە لەزمانی کوردیدا ناوی ئەبستراکتی دروست دەکات و سوفیکسی (ی) کە ســـیفەتی نیسبی دروست دەکات وەك یەك سوفیکس پێشانیان داوە ، بە بێ ئەوەی کە هەوڵ بدەن بۆ جوداکردنەوەیان لە یەکتری و بە دوو سوفیـکسی سەر بەخۆیان بژمێرن ، کە لە راســـتیدا وەك لە ئەنجامی ئـــەم دیراسەیەمانـــدا بـــۆمان دەردەکەوێت دوو سوفیـکسی جیاواز و سەربەخـۆن .

بۆ نموونە مامۆستا سەعید کابان لە باسی (قسمیك لە ادوات حرفان معانی)دا دێتە سەر حەرفی ی و دەڵێت ئەم حەرفە بۆ نیسبەتە[1]وە چەند نموونەیەك دێنێتەوە وەك : ( بەغدادی ، کەرکوکی ، هەولێری ) ، هەر لە هەمان کاتدا وای پیشان دەدات کە دیسانەوە بە یارمەتی هەمان حەرفی ( ی ) ئەم مەسدەرانە دروست کراون ( جوانی ، پیری ، ژیری )[2].

مامۆستا تۆفیق وەهبی لە بەشی ( ناوی دروستکراو لە ناو )[3] دا باسی ئەدانی ( ی ) دەکات کە بە یارمەتی ئەو ئەداتە ناوی دروستکراو

(١) سەعید سدقی کابان ، مختصر صرف ونحوی کوردی ، جزء (١) ، بەغدا ، ١٩٢٨ ، ل : ٦

(٢) سەعید سدقی کابان ، مختصر صرف ونحوی کوردی ، جزء (١) ، بەغدا ، ١٩٢٨ ، ل : ٦٦

(٣) توفیق وەهبی ، دەستووری زمانی کوردی ، جیزمی یەکەم ، بەغدا . ١٩٢٩ ، ل : ٥٤

لە ناو دروست دەکرێت وە هەندێ نموونەی هێناوەتەوە لەوانە :

کوڕ + ی = کوڕی ، کچ + ی = کچی

ژن + ی = ژنی

پاشان لە باسی ( سیفەتی چۆنی دروست کراو )[4]دا باسی ئەداتی ( ی ) دەکات و بە یەکێك لەو ئەداتانەی کە سیفەتی چۆنی دروست دەکات دادەنێ .

ئەمەش هەندێك لەو نموونانەیە کە هێناویەتیەوە :

زستان + ی = زستانی کەرکوك + ی = کەرکووکی

قاوە + ی = قاوەیی کەراچی + ی = کەراچیی

لێرەدا بۆمان ئاشکرا دەبێت کە مامۆستا تۆفیق وەهبی لە هەردوو شوێنەکەدا ، واتە لە باسی ناوی دروستکراو لە ناو و لە باسی سیفەتی چۆنی دروست کراودا ، ئەوەی دەست نیشان نەکردوە کە ئایا لە هەردوو شوێنەکەدا ئەو ئەداتی ( ی )یەی کە ناوی دروست کراو دروست دەکات و ئەداتی ( ی )یەی کە سیفەتی چۆنی دروست دەکات ، هەر هەمان ئەداتە یاخود دوو ئەداتی جیاوازن ؟

مامۆستا ( نوری عەلی ئەمین )یش هەر بە هەمان رێگەدا رویشتوە ، بە بێ ئەوەی جیاوازی نێوان ئەو دوو سوفیکسە دەربخات و وەك دوو سوفیکسی سەربەخۆ لێیان بدوێت ، تەنانەت کاتێك کە

---

(٤) توفیق وەهبی ، دەستووری زمانی کوردی ، جزی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٢٩ ، ل : ٦٥

نمونەی هێناوەتەوە بۆ ئەو وشـــانەی کە بەیارمەتی ســوفیکسی (ی) دروست کراون ، نمونەی ناوی ئەبستراکتی و سیفەتی نیسبی پێـکەوە هێناوەتەوە[٥] وەك :

بەرزی ، گەرمی ، مزگەری ، شارەزوری ، ئازایی ، کلاوی

لێرەدا دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە بەلای مامۆستا ( نوری عەلی ئەمین )ەوە وایە ئەو سوفیکسی (ی )یەی کە چۆتە سەر وشەی : بەرز ، گەرم ، مزگەر ، ئازا هەرهەمان سوفیکسە کە چۆتە سەر وشـەی : شارەزوور ، کڵۆیە .

هەروەها مامۆستا مەسعود محەمەد کاتێك کە باسی بەکار هێنانی حەرف (ی ) لە زمانی کوردیدا دەکات[٦] وەك دوو سوفیکسی جیاواز پەنجەی بۆ راکێشاون و ناوی بردوون ، بەڵام بە بێ ئەوەی جیاوازی نێوانیان دەربخات .

کەواتە وەك بۆمان دەرکەوت زمانەوانانی کوردی عێراق تێـکرا بایە خێـکی ئەوتۆیان بە باس و دیراسەی مێژوویی سوفیکسەکانی زمانی کوردی نەداوە ، بەڵـکو لە گەڵکارە زمانەوانیەکانی تریانـــدا و بەشێوەیەکی زۆر کورت لە سوفیکسەکان دواون .

(٥) نوری عەلی ئەمین ، گرتنی کەلێنێـکی تر لە رێزمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٥٨ ، پاشگری ژمارە ( ٣٧ )

(٦) مەسعود محەمەد ، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد ، بەرگی یەکەم ـ بەشی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل : ٧٢

[ رەخنـه :

ئامۆژگارییـێکم هەیە لە ڕوی ڕەوانی و جـــوانی تەعبیرەوە . ڕستەی ( زمانەوانانی کوردی عیراق تێکڕا بایەخێکی ئەوتۆیان بە باس و دیراسەی مێژوویی سوفێکسەکانی زمانی کوردیی نەداوە ) ئەو واتـایە ناگەیەنێ کە نوسەر مەبەستیەتی و دەیەوێ بڵێ ( هیچ یەکێك لـــە زمانەوانانی کوردی عیراق . . ) چونکە وشـــەی ( تێکڕا ) لێرەدا لەگەڵ ( نفی ) ناگونجێت بۆ ئەو مەبەسە . ڕســـتەی گوتارەکە وا رادەگەیەنێ کە ( زمانەوانانی کوردی عیراق بەتێکڕایی بایەخیان نەداوە بەو باسە بەڵـکو هەر یەکەیان سەربەخۆ بایەخیان پێ داوە ) . وشەی ( تێـکڕا ) وشەیێـکی ( ایجابی )یە بایەخ نەدانیش ( سلبی )یە . بە نمونە کە گوتت ( هەمیشە ) دەبێ ڕستەی دوای ئەو ( ایجابی ) بێت ئەگینـا واتاکەی ئەوە نابێ کە لە خودی وشەکەدا هەیە : ( هەمیشە خۆشـم ناوێت ) واتە ( ناوناوە خۆشم دەوێت ) نەك ( هەرگیز خۆشم ناوێت ) .

کوێی نەدان بەم ڕاستییە هەڵەیە ، لە هەرکەسێکەوە بێت .

نرخێنەر ]

زمانەوانانی یەکێتی سوڤێتیش تا ئێستا دیراسەیەکی مێژوویی ئەم دوَ سوفیکسـەیان نەکردوە . بۆ نمـــونە پرۆفیسۆر باکایێڤ لە باسی چۆنێتی ناوی دروست کراو و ســــیفەتی دروســت کراودا[7] باسی

(٧) ج. خ. باکایێف ، زمانی کوردی یەکێتی سوڤێت ، مۆسکۆ ، ١٩٧٣ ، ل : ٢٤٤ ، ٢٤٥

سوفیکسی ( ی î ) کردوه که دەبێت به هۆی دروست کردنی ناوی ئەبستراکتی و سیفەتی نیسبی له زمانی کوردیدا ، به بۆ ئەوەی ئەوە رۆن بکاتەوه که ئایا له هەردو حالەتەکەدا هەر هەمان سوفیکسی ( ی î )یه ؟ یان دو سوفیکسی سەربەخۆن و ئەسلیان جیایه و هەریەکه به تەنها رۆلی تایبەتی خۆی له مەیدانی وشەسازی له زمانی کوردیدا دەبینێت ؟

پرۆفیسۆر ( کوردۆیێف )یش سوفیکسی ( ی î ) که ناوی ئەبستراکتی دروست دەکات و سوفیکسی ( ی î ) که سیفەتی نیسبی له زمانی کوردیدا دروست دەکات له یەکتر جیا نەکردۆتەوه[8] ، هەروەها پیشانیشی نەداوه که ئەو سوفیکسی ( ی î )یەی ناوی ئەبستراکتی دروست دەکات و ئەو سوفیکسی ( ی î )یەی سیفەتی نیسبی دروست دەکات له راستیدا دو سوفیکسی جیاواز و سەربەخۆن یاخود دو سوفیکسن که تەنها فۆرمەکانیان لەیەك دەچێت ؟

هەروەها مامۆستایان کەریمی ئەیوبی و سەمیرنۆڤا له کتێبی ( دیالێکتی موکری )دا کاتێك که باسی چۆنێتی دروست کردنی ناو و سیفەت دەکەن[9] دێنه سەر ئەو بەشەی وشەسازی که به یارمەتی

(٨) ك. ك. کوردۆیێف ، گرامانیکی زمانی کوردی ، مۆسکۆ ـ لینینگراد ، ١٩٥٧ ، ل. ٢٩٧

(٩) ئەیوبی و سەمیرنۆڤا ، دیالێکتی موکری ، لینینگراد ، ١٩٦٨ ، ل. ٤٠ ، ٢٩

سوفیکس پێك دەهێنرێت وە وایان پێشان داوە کە بە یارمەتی سوفیکسی (ی ۱) ناوی ئەبستراکتی دروست دەکرێت وە هەروەها بە یارمەتی سوفیوسی (ی ۱) سیفەتی نیسبی دروست دەکرێت . وا دیارە بە رای ئەم مامۆستایانە هەر یەك سوفیکسی (ی) هەیە ، ئەگینا دەبوایە ئەگەر بە شێوەیەکی درێژیش نەبوایە بە شێوەیەکی کورت ئەوەیان دەشت نیشان بکردایە کە ئەو سوفیکسی (ی ۱)یەی کە ناوی ئەبستراکتی دروست دەکات هەمان سوفیکسی (ی ۱)نییە کە سیفەتی نیسبی دروست دەکات .

[ رەخنە :

نوسەر لەم نمایشتەی دەرخستنی جودا نەکردنەوەی ئەسلی دوو پاشگری (ی) نیسبەت و (ی) مەعنا لە لایەن نوسەرانی کوردەوە چەند جاران یەك قسە دەڵێتەوە . وا دەزانم نوسەر دەیتوانی ، پێویستیش بو لە سەری ، بە ناوی زمانەوانەکاندا بێتە خوارێ و یەکجاری رەخنە لە هەموان بگرێ وە یاخود ئەگەر پێویستی تعبیر و جوانی نوسین داخوازی کرد ناوەکان بکاتە یەك دوو لیستە و لێیان بێتەوە بە رایەکانیانەوە . ئەگەر ئەمەی کردبا دەیتوانی رێزێکی درێژ لە لاپەڕەکان کورت بکاتەوە بێ ئەوە هیچ زیانێك بە ناوەرۆکی نوسینەکەی بگات .

ئەو رەخنەیەی لە منیشی گرتوە کە گۆیا من باسی ئەم دوو پاشگرەم کردوە بێ ئەوە جیاوازی - جوداوازی راستە - نێوانیان

دەربخەم هەر بە قسەی خۆی رەت دەکرێتەوە چونکە ئەو لە پێشەوە دەڵێ « وەك دوو سوفیکسی جیاواز پەنجەی بۆ راکێشاون » . باشتر ئەوە بوو بڵێ لە باسەکەیدا بۆ بنجی مێژوویی سوفێکسەکان نەچوە نەك جوداوازی نێوانیانی دەرنەخستوە چونکە ئەم قسەیە وا رادەگەیەنێ من لەم جوداوازییە نەگەیشتووم کەچی بە باسەکەدا بچیتە خوارەوە دەبینی هەرگیز یەکێکیان تێکەڵ بەویتر نەکراوە ، ج پێویستیش نەبوو لەو گوتارەدا ( بەکارهێنانی «ی» ... ) بکەومە سەر دەرهێنانی بنجی هەمو یەکێك لەو ئەمرازانەی تێیدا باس کراون .

لێرەدا رەخنەیێکی بچوکیشم هەیە دەربارەی شێوازی نوسین : لە چەند دێڕێکدا سێ جاران وشەی ( هەروەها ) بەکار هاتوە . ئێمە کە بە دیراسەی زمانەوە خەریك دەبین دەبێ جوان و راست بدوێین .

[ نوخێنەر ]

بەم جۆرە بۆمان ئاشکرایە کە تا ئێستا بە شێوەیەکی گشتی دیراسەی مێژوویی سوفیکسەکانی زمانی کوردی و بە شێوەیەکی تایبەتی سوفیکسی ( ی ) کە ناوی ئەبستراکتی دروست دەکات و سوفیکسی ( ی ) کە سیفەتی نیسبی دروست دەکات نەکراوە ، کە دەتوانین ئەم دوو سوفیکسەی کە تا ئێستا دیراسەیەکی مێژوویان نەکراوە بە بەرهەمدارترین سوفیکسیان لە زمانی کوردیدا دابنێین بە تایبەتی سوفیکسی ( ی î ) کە ناوی ئەبستراکتی دروست دەکات و هەروەها بە بەراوردکردنی ئەم دوو سوفیکسە لەگەڵ سوفیکسەکانی تری زمانی

کوردیدا بۆمان ساغ دەبێتەوە کە ئــەم دوو سوفیکسە بە تایبەتی سوفیکسی (ی) کە ناوی ئەبستراکتی دروست دەکات گەورەترین رۆڵ لە مەیدانی وشە سازی لە زمانی کوردیدا دەبینن و بە بەردەوامی دەچنە سەر جۆرەها وشەی جیاواز جیاواز و بەمە دەبن بە هۆی دەوڵەمەند کردنی زمانی کوردی .

بۆ ساغ کردنەوەی ئەسلی سوفیکسی (ی î) ی ناوی ئەبستراکتی و سوفیکسی (ی î) ی سیفەتی نیسبی و جیا کردنەوەیان لە یەکتری و دەرخستنی رۆڵی هەردوکیان لە مەیدانی وشەسازی لە زمانی کوردیدا ، ئێمە لەم کارەماندا هەوڵ دەدەین کە دیراســـەیەکی مێژوویی هــەردوو سوفیکسەکە بکەین ، بۆ ئەوەی بگــانگەیەنێت بەو مەبەســـتەی کە دەمانەوێت ، واتە ســــاغ کردنەوە و لێکۆڵینەوەی مێژوویی هەردوو سوفیکسەکە . بۆ ئەم کارە باشترین رێــگە بەلای ئێمــەوە ئەوەیە کە تەماشای کۆنترین نوسراو کە بەزمانی کوردی نوسرابێت و تا ئێســتا مابێتــەوە بکەین ، بەڵام وەك لە هەمووتان ئاشکرایە هەتا ئێســـتا نوسراوێك کە زۆر لە کۆنەوە بە زمانی کوردی نوسرابێت و تا ئێستا مابێتەوە نییە .

مەبەستمان ئەوەیە کە بۆ نمونە هیچ دەستنوسێك یاخود پارچە نوسراوێك کە بەزمانی کوردی نوسرابێت و مێژووی ئەو دەستنوسە یاخود ئەو پارچە نوسراوە بۆ پێش لە دایك بونی بگەڕێتەوە ، یاخود بە شێوەیەکی تر کە ٢٠٠٠ یاخود ٢٥٠٠ ساڵ لەمەوپێش نوسرابێت

له بەر دەستماندا نییە . هۆی نەبوونی ئەو نوسراوانە و ئایا بوون و فەوتاون ؟ یان جۆرەها پرسیاری تر لەم بارەیەوە ئێمە لێرەدا ناتوانین وەڵامیان بدەینەوە ، بەڵکو هەڵیاندەگرین بۆ کاتێکی تر ، چونکە ئێمە باسەکەمان تەنها بۆ سوفیکسی (ی î)ی ناوی ئەبستراکتی و سوفیکسی (ی î) سیفەتی نیسبی تەرخان کردوە .

بەم جۆرە وای بە باش دەزانین کە سەرەتای دیراسە مێژوییەکەمان دەربارەی ئەم دوو سوفیکسە لە زمانی فارسی ناوەڕاستەوە(*) یاخود (پەهلەوی)یەوە دەست پێبکەین ، چونکە زمانی فارسی ناوەڕاست لە ساڵی (٦٥١ ـ ٢٢٤)ی پێش لە دایك بووندا زمانی نوسین و ئەدەبی حکومەتی ساسانی بوە و نزیکەی (١٠٠٠) ساڵ قسەی پێکراوە(١٠) ، هەروەها لەبەر ئەوەی کە زمانی فارسی ناوەڕاست یەکێکە لەو زمانانەی سەر بە کۆمەڵی زمانە ئێرانیەکانە و تا ئێستا زۆر نوسراوی کۆن(**) کە مێژویان بۆ پێش

(*) زمانی فارسی ناوەڕاست زمانی پەهلەویشی پێ دەکوترێت ، بەلام لەبەر ئەوەی زاراوەی فارسی ناوەڕاست لە زاراوەی پەهلەوی زیاتر بەکار دێت و جیهانیترە ، ئێمەش هەر زاراوەی فارسی ناوەڕاست بەکار دێنین .

(١٠) ڤێراسیرگینیە ڤنارەستەرکوێڤا ، زمانی فارسی ناوەڕاست ، مۆسکۆ ، ١٩٦٦ ، ل. ٧

(**) له هەلێکیتردا بە درێژی باسی هەندێ بەشی گرامانیکی زمانی فارسی ناوەڕاست دەکەین ، لەگەڵ ئەوەشدا باسی ئەو نوسراوانەی کە بەم زمانە نوسراوە .

لە دایك بوون و دوای لە دایك بوون دەگەڕێتەوە بەم زمانە، واتە بە زمانی فارسی ناوەڕاست نوسراوەتەوە و ماوەتەوە لە پاشاندا لە نێوان زمانی کوردی و زمانی فارسی ناوەڕاستدا لەبەر ئەوەی کە هەردوکیان دوو زمانی سەر بە یەك خێزانی خزمایەتیەکی زۆر نیزیك هەیە. لەبەر ئەم هۆیانە بازانین لە زمانی فارسی ناوەڕاستدا ناوی ئەبستراکتی و سیفەتی نیسبی چۆن و بە یارمەتی چ سوفیکسێك دروست دەکران.

جا لەبەر ئەوەی سوفیکسی (ی î )ی ناوی ئەبستراکتی چ لە ڕوی بەرهەمدارییەوە و چ لە ڕوی ئەو ڕۆڵە گەورەیەی کە لەمەیدانی وشەسازی لە زمانی کوردیدا دە یبینێت زیاترە لە سوفیکسی (ی î) کە سیفەتی نیسبی دروست دەکات، لە پێشەوە باسی چلۆنێتی دروست کردنی ناوی ئەبستراکتی لە زمانی فارسی ناوەڕاستدا دەکەین، پاشان باسی چلۆنێتی دروست کردنی سیفەتی نیسبی.

## دروست کردنی ناوی ئەبستراکتی
## لە زمانی فارسی ناوەڕاستدا

لە زمانی فارسی ناوەڕاستدا ناوی ئەبستراکتی بە یارمەتی سوفیکسی (ئیه îh) و سوفیکسی [ئاد «ئاذ»] دروست کراوە لەبەر ئەوەی لە زمانی فارسی ناوەڕاستدا زوربەی هەرەزۆری ناوە ئەبستراکتێکان بە یارمەتی سوفیکسی (ئیه) پێكهاتون و ژمارەیەکی یەجگار کەمیش لەو ناوانە بەیارمەتی سوفیکسی [ئاد «ئاذ»] پێكهاتون، ئێمە ئێستا لەم کارەماندا واز لە سوفیکسی

[ ئاد « ئاذ » ] دێنین بۆ کاتێکی‌تر بۆ ئەوەی وەك باسێکی سەربەخۆ لێی‌بدوێین و دێینە سەر چۆنێتی دروست کردنی ناوی ئەبستراکتی بەیارمەتی سوفیکسی ( ئیه ) .

پرۆفیسۆر ( زالیمەن ) باسی چۆنێتی دروست کردنی ناوی ئەبستراکتی دەکات[11] له زمانی فارسی ناوەڕاستدا که چۆن بەیارمەتی سوفیکسی ( ئیه ) دروست کراون ، هەروەها چەند نمونەیەکیشی هێناوەتەوە لەوانە :

| ناو | | سوفیکس | | ناوی ئەبستراکتی | بەکوردی |
|---|---|---|---|---|---|
| راست | + | ئیه | > | راستیه | راستی |
| شاد | + | ئیه | > | شادیه | شادی |
| داشتار | + | ئیه | > | داشتاریه | بەجێ‌هێنان ( تأدیه ، إجراء ، قیام بـ ) |

[ رەخنە :

ئەم سوفیکسە دەبێ ( یه ) بێ نەك ( ئیه ) چونکه که له

(۱۱) Grundriss Der Iranischen Philologie Erster Band, C. Salemann, Mittelpersisch, Strassburg, 1895 - 1901, S. 280.

بەشێك له فیلۆلۆجی ئیرانی ( بەرگی یەکەم ) ، س. زالیمەن ، فارسی ناوەڕاست ، ستراسبورگ ، ۱۸۹۵ ــ ۱۹۰۱ ، ل. ۲۸۰ ( بەئەڵەمانی )

کۆتایی وشـە دەردەکەوێت چ دەنگی ( ئـ ـ هەمزەی عەرەبی ) لە ناودا نیە . زیاد کردنی هەمزە لە سەرەتای دەنگە ڤاولەکانی ( ی ، و ) هەروەها ( ە ـ فەتحەی عەرەبی ) هەڵەی بە کەلێك نوسەری کورد کردوە کە دەنوسن دەنگی ( ئێ ، ئی ، ئۆ ، ئو ، ئە ) مەبەسیشیان ( لێ ، ی ، ۆ ، وَ ، ە ) یە . لە ئاخاوتندا بە ناچاری دەبێ دەنگێك بخرێتە پێش ڤاولەکانەوە بۆ درکاندنیان بەڵام لە نوسیندا پێش خستنی هەمزە هەڵەی رۆتە ، زۆر جارانیش مێشکی خوێنەر دەخلیسکێنێ و وای تێدەگەیەنێ کە ڤـاولەکە سەرلەبەری ( ئۆ ، ئێ ، ئە ) یە نەك ( ۆ ، لێ ، ە ) . لە وتووێژدا وا بوە بە تەواوی ئەم هەڵەیە مانـــدوی کردوم .

هەر بەو پێیەش سوفیکسی ( ئاد ، ئاذ ) دەبێ بکرێتەوە ( اد ، اذ ) . لە هەر شوێنێکی گوتارەکەدا ئەم هەمزەیەمان بێتـــە پێش بەر ئەم رەخنەیە دەکەوێ .

[ نرخێنەر ]

پرۆفیسۆر ( رەستەر گویڤـا )(*) بەشێوەیەکی زۆر درێژتر لە پرۆفیسۆر ( زالیمەن ) باسی چۆنێتی دروست کردنی ناوی ئەبستراکتی لە زمانی فارسی ناوەڕاستدا بەیارمەتی سۆفیکس ( ئیھ îh ) دەکات[۱۲] .

(*) پرۆفیسۆر ( ڤێرە سرکێنیەڤنا رەستەرگویڤا ) لە ئەنیستۆنی زانستی زمان لە مۆسکۆ سەرۆکی بەشی زمانە ئێرانیێکانە .

(۱۲) ڤێرە سرکێنیەڤنا رەستەرگویڤا ، زمانی فارسی ناوەڕاست ، مۆسکۆ ، ۱۹٦٦ ، ل. ۳۷

پرۆفیسۆر رەستەر گوێفا زۆر بە باشی بۆمان دەردەخات کە سوفیکسی (ئیه) لە زمانـی فارسی ناوەڕاستدا سوفیکسێکی زۆر بەرهەمـدار بوە و چۆتە سەر ژمارەیەکی زۆر لە وشەی جیاواز جیاواز بۆ نمونە چۆتە سەر ( ناو ، جێناو ، سیفەت ... هتد )وە نـاوی ئەبستراکتی لێ دروست کردوَن ، هەروەها چۆن چۆتە سەر وشەی ئاسان هەر بـەو چەشنەش چـۆتە سەر وشەی بارگران وەك لەم نمونانەی خوارەوەدا بۆمان دەردەکەوێت(*) :

آ ) سوفیکسی ( ئیه ih ) چۆتە سەر ناو و ناوی ئەبستراکتی لێ دروست کردوە وەك :

| ناو | سوفیکس | | ناوی ئەبستراکتی | بەکوردی |
|---|---|---|---|---|
| ١ـ دوست + | ئیه | > | دوستیه | دۆستی(**) |
| ٢ـ پاتخشاه + | ئیه | > | پاتخشاهیه | پادشایی |

ب) دەچێتە سـەر سیفەت و ناوی ئەبستراکتی لێ دروست دەکات :

| سیفەت | سوفیکس | | ناوی ئەبستراکتی | بەکوردی |
|---|---|---|---|---|
| ١ـ تاریك + | ئیه | > | تاریکیه | تاریکی |

(*) لەبەر ئەوەی کە نمونەکانی زمانی فارسیمان لە لاتینیەوە وەرگرتوە ، بە ئیملای کوردی نوسیومانەتەوە .

(**) دۆستی : لە کرمانجی سەروودا بەکار دێت ، بەلام لە کرمانجی خوارودا زیاتر ( دۆستایەتی ) بەکار دێت .

٢ـ ڤەت + ئیە > ڤەتیە بەدتی
ڤەت = بەد

پ) دەچێتە سەر کەسی سێیەمی تاکی فیعلی (هەستن) لە حاڵەتی ئیعتیادی و نەفیدا و ناوی ئەبستراکتی دروست دەکات :

بەکوردی

١ـ هەست + ئیە > هەستیە ژیان ، وجود ، کیان ، بۆن
٢ـ نیست + ئیە > نیستیە وجودنەبۆن ، نەبۆن

هست : رەگی رابوردوی فیعلی (هستن)ە بۆ کەسی سێیەمی تاك
نیست : « « « « (نیستن)ە « « « «

[ رەخنە :

ناوی ئەبستراکت کە لە (هستن ، نیستن) دروست دەکرێت ناشێ بگوترێ داڕشتنەکە لە کەسی سێیەمی تاکەوە دێت : لادانی (ن)ی چاوگ لە هەمۆ فیعلەکانی تێنەپەڕ رواڵەتی کەسی سێیەمی تاك پێك دێنێت ، بەڵام ئەو رێژەیەی دوای لادانی (ن)ەکە پەیدا دەبێت بۆ تەرکیبی فیعلەکە دەگەڕێتەوە نەك کەسی سێیەمی تاك چونکە ئەگەر وابا واتای رێژەکە بۆ تەنها ئەو کەسە دەبۆ وەك کە بڵێین (نوستۆ) لە (نۆست)ەوە پێك هاتوە کە هەر بۆکەسی سێیەمی تاکە نەك لە فیعلی (نوستن)ەوە ئەوسا نابێ بڵێم (من نوستۆم ، تۆ نوستۆیت ،

ئێمه نوستوین ...) چونکه من و تۆ ئەو (نوستو)وه نین که کەسی سێیەمە ، من و تۆ ئەو (نوستو)وەین که له فیعلی (نوستن)ەوه وەرگیراوه . سەیری ، له فیعلی تێپەڕ چونکه راناوی کەسی سێیەمی تاك هەیە رێژەی ناوی بەرکار (اسم مفعول) دوای لابردنی راناوەکه وەردەگیرێت وەك وشەی (نوسراو) که له نوسینەوه وەرگیراوه ئەگەر له (نوسی) کەسی سێیەمی تاك بوایە دەبو بگوترێ (نوسیراو) . وشەی (نیستی)ش ئەگەر له فیعلی کەسی سێیەمی تاکەوەبا واتاکەی دەبوه (مطلق)ی نەبونی کەسی سێیەمی تاك .

دیارە زیادێك بێتە سەر (چاوگ ـ فعل) هەموویان له روالەتی کەسی سێیەمی تاك زیاد دەکرێن ئەگەر فیعلەکه تێنەپەڕ بێت . بە نمونە ، چاوگی (گەڕان) که نیشانەی مصدریەتی لێ قرتا دەبێتە «گەڕا» که به روالەت بۆ کەسی سێیەمی تاکە . کاتێك ویستمان لەم فعلەوه رێژەی وەصف وەرگرین دەڵێین (گەڕایەوه ـ فلانه کەس پیاوێکی گەڕایەوەیە) . لێرەدا ناشێ بگوترێ ئەم (گەڕایەوه) هەر له فیعلی کەسی سێیەمی تاکەوه وەرگیراوه نەك له مادەی فیعلەکەوه چونکه ئەگەر وابا نەدەبو بڵێم (من گەڕایەوەم ، تۆ گەڕایەوەیت) .

(هستی و نیستی)ش له کوردیدا دەبێتە (هەبونی ، و نەبونی ، وەیاخود هەبونی و نەبونی) نەك (ژیان ، بون ، وجود نەبون ...) وەك له گوتارەکەدا نوسراوه . دیسانەوه (هستن) رابردو نیه ، دیاریشه

( نیستن ) وشەیێکی سەربەخۆ نیــە بەڵــکو ئەدانی نفی چۆتە ســەر ( هستن ) و وشەکەی دروست کـــردوە هەرچەند گۆڕانێك بەســەر ڤاڵبەکەدا هاتوە وەك کە ( نائومید ) دەبێتە ( نەومید ) . بە خۆڕاییش نیە ( هستن ، نیستن ) قبول دەکەن ببنە ئەبستراکت بەڵام ئێرە جێی درێژەی باسەکەی تێدا نابێتەوە .

[ نرخێنەر ]

ت ) دەچێتە سەر ئەو وشە بارگرانانەی کە لە دوَ وشە پێك هاتوَن :

| وشە | سوفیکس | ناوی ئەبستراکتی | بەکوردتی |
| --- | --- | --- | --- |
| چەشم ئەرشك + ئیە | > | چەشم ئەرشکیە | حەسودتی |

چەشم : چاو

ئەرشك : حەسود

ج ) دەچێنە سەر وشەی بارگران کە لە ( ناو + سیفەت ) پێك هاتوَن وەك :

| وشە | سوفیکس | ناوی ئەبستراکتی | بەکوردتی |
| --- | --- | --- | --- |
| ڤەت کامەك + ئیە | | ڤەتکامەکیە | حەزبەخرابەکردن |
| | | | قەسد خرابی |

کامەك : ئارەزوَ ، ئاوات

[ رەخنە :

وشەی ( چەشم ئەرشك ) وەك وشەی ( ڤەت کامەك ) لە ناو و

سیفەت پێك هاتوە هەر هێندەیان فەرقە لە تەرکیبی یەکەمدا وشـەی (چەشم)، کە ناوە، پێش کەوتوە و (ئەرشك ـ حەسوٗد)، کـە سیفەتە، پاش کەوتوە بە پێچەوانەی تەرکیبی دوەم (فـەت ـ بەد) سیفەتە پێش کەوتوە (کامەك)یش نـاوە دوا کەوتوە . لە کوردیی ئێستاکەشدا کە دەگوترێ (مێشك وشك) سیفەتەکە دوا کـەوتوە بەڵام لە (وشکە منەت)دا سیفەتەکە پێش کـەوتوە .

لەمەش بترازێ ، ناشێ بگوترێ (چەشم ئەرشك) دوٗ وشەیە بەڵام (فەت کامەك) ناو و سیفەتە چونکە دیارە سیفەتیش هەر وشەیە .

[ نرخێنەر ]

بەم جۆرە دەبینین کە سـوفیکسی (ئیە) لە زمانی فارسـی ناوەڕاستدا دەچێتە سەر ژمارەیەکی زۆر لە وشەی جیاواز جیاواز و دەیانکات بە ناوی ئەبستراکتی .

پاش ئـەوەی کـە باسـی چـۆنێتی دروست کردنی ناوی ئەبستراکتمان لە زمانی فارسـی ناوەڕاسـتدا کرد ، دێینە سەر باس کردنی چۆنێتی دروست کردنی نـاوی ئەبستراکتی لە یەکێ لە زمانە ئێرانییە تازەکاندا . ئێمە لێرەدا زمانی فارسی تـازە هەڵدەبژێرین ، جابزانین لە زمانی فارسی تازەدا نـاوی ئەبسـتراکتی چۆن دروست دەکرێت .

## چۆنێتی دروست کردنی ناوی ئەبستراکتی لــە زمـــانی فارســـی تـــازەدا

پرۆفیسۆر (ڤۆن پاول) وای پیشان دەدات کـە گوایە ئـەو سوفیکسی (ی)یەی لە زمانی فارسی تازەدا ناوی ئەبستراکتی دروست دەکات بە ئەسڵ دەچێتەوە سەر سوفیکسی (ئیھ) کە لە زمانی فارسی ناوەڕاستدا نـــاوی ئەبســتراکتی دروســـت دەکـرد[١٣] . پاشـان چەند نموونەیەکی نـــاوی ئەبستراکـتی کـە بە یارمـەتی سوفیکسی (ی î ) کە بە فارسی تازە پێی دەوترێت (یا ی مەسدەری) هێناوەتەوە و یەکســەر بەراوردی لە گەڵ زمانی فارسی ناوەڕاستدا کردوە بۆ نموونە :

| زمانی فارسی تازە(*) | | | زمانی فارسی ناوەڕاست |
|---|---|---|---|
| وشـە | سوفیکس | ناوی ئەبستراکتی | ناوی ئەبستراکتی |
| پاتخشاە | ی | پاتخشایی | پاتخشاەیھ |
| نیك | ی | نیـکی | نیفەکیھ |

(١٣) بەشێك لە فیلۆلۆجی ئێرانی (بەرگی یەکەم) ، پاول هــۆرن ، زمانی تازەی نوسینی فارسی ، ستراسبورگ ، ١٨٩٥ ــ ١٩٠١ ، ل. ١٨٠

(*) وەك لە تێبینێـکەی پێشودا گوتمان لەبـەر ئەوەی نموونەی نـاوە ئەبستراکتێـکانی زمانی فارســی ناوەڕاست وە هەروەها زمانی فارســی تازەمان هــەر لە لاتینییەوە وەرگرتوە ، بە ئیملای کوردی وەك چۆن لە لاتینییەکدایە نوسیومانەتەوە .

| زیڤه نده کیه | زینده‌گی[*] | ی | زینده |
|---|---|---|---|
| چکۆنیه | چکۆنه‌گی[**] | ی | چکۆنه‌گ |

هەروەها هەندێ نموونەی‌تری ناوی ئەبستراکتی لە زمانی فارسی، تازەدا هێناوەتەوە کە بە یارمەتی سوفیکسی ( ی ) دروست کراون وەك : نالندەگی ( ئازار ) ، خیرەگی ( ئازایی ) .. هتد

پرۆفیسۆر ( پێیسیکۆف )یش ئەو سوفیکسی ( ی )یەی کە لە زمانی فارسی تازەدا ناوی ئەبستراکتی دروست دەکات بە ئەسڵ دەباتەوە سەر سوفیکسی ( ئیه )[14] کە وەکو زانیمان لە زمانی فارسی ناوەڕاستدا ئەم سوفیکسە واتە ( ئیه ) ناوی ئەبستراکتی دروست دەکرد .

---

(*) لە زمانی فارسی تازەدا ئەگەر وشەیەك کوتایی بە حەرفی دەنگداری ( ه ) هات کە بە فارسی پێی دەوترێت های غیر مەلفوزە ، ئەوا حەرفی ( گ ) دەچێتە نێوان حەرفی ( ه ) و سوفیکسی ( ی ) .

(**) نیکی : چاکی ، زیندەگی : ژیان ، چکۆنەگی : چۆنیەتی

[ زیندەگی : بە واتای زیندوەتی دێت . لە کوردیدا وشەی ( ژیان ) بەرانبەر ( زیستن )ی فارسییە کە هەردوویان فیعلن . زیندەگی و زیندوەتیش ناوی ئەبستراکتن .

نوخێنەر ]

(14) ل. س. پێیسیکۆف ، دیراساتی وشەسازی لە زمانی فارسیدا ، مۆسکۆ ، 1973 ، ل. 184

| وشە | سوفیکس | ناوی ئەبستراکتی | بە کوردی |
|---|---|---|---|
| زەرد | تی | زەردتی | زەردتی |
| تەنہا | تی | تەنہایتی | تەنہایتی ، تەنیایتی |
| ئەقەبوفتادە | تی | ئەقەبوفتادەگتی | دواکەوتوویتی |
| سەردرگوم | تی | سەردرگومتی | شێرزەیتی |
| ئەز کورە دررفتە | تی | ئەز کورە دررفتەگتی | تۆڕەیتی ( إنفعال ، حدّە ) |
| گوشبەزەنگ | تی | گوشبەزەنگتی | چاوەڕوانتی |
| هەقبەجانەب | تی | حەقبەجانەبتی | حەقلای ئەو |
| سەربەزێر | تی | سەربەزێرتی | شـەرمنتی |

[ رەخنە :

ئەم سـوفیکسەی ( تی ) کە بۆ داڕشتنی ناوی ئەبستراکت بێت بە زۆری و لە بنەڕەتدا دەچێتـە دوای « صفە »تەوە . نموونەکانی کە نوسەر هێناوەتیەوە لەم لیستانەدا چ وشەی سادەبێ و چ وشـــەی لێـکدراو ـ ئەو دەڵێ بارگران ـ هەمویان وشەی وصفین . من لە گوتاری ( بەکار هێنانی « ی » لە رێزمانی کوردیدا ) ئەم لایەنە و گەلێك لایەنی تری جۆرەکانی داڕشتنی ناوی ئەبستراکتم روون کردۆتەوە کە ئەگەر بە تەواوی و بێ کەلەبەریش نەبێ ئەوەندەی تێـدایە ببێتە هۆی جودا کردنەوەی داڕشتنی ناوی ئەبستراکت لە صفە و لە وشەی وەك بەرد ، کورد ، خزم و ... هتـاد . لەو گوتارەدا باس کراوە

ریژەی (یانی ، یانایی - رەشی ، رەشایی ، ترشی - ترشایی) بۆچی دوو جۆرە و هەر ئەبستراکتیشن .. ئەوەشم گوتوە کە کۆتایی وشە (تی) بۆ ، ریژەی تایبەتی پەیدا دەبێ بۆ دروست کردنی ئەبستراکت لە وشەکە وەك (سپی ، سپیەتی - برسی ، برسییەتی) . باسیشم کردوە چوار جۆرە پاشگری ئەبستراکت هەیە لە کوردیدا و هەر یەکەش بۆ مەبەستێکە (تی ، ایی ، ەتی ، ایەتی) . نوسەر ئەمانەی خوێندۆتەوە ، لە گوتارەکەشیدا ناوی گوتارەکەی من دێنێ . وا دەزانم پێویست بوو ئیشارە بۆ هەمویان بکا ، کە پێشیان رازی نەبێ هەڵەکەیان بدۆزێتەوە .

ئەمراز وەیا سوفیکسی (تی) ناتوانێ واتای ئەبستراکت لە غەیری (وصف) و ریژە و ناوی ئەوتۆ کە وصفی تێدا بێ پەیدا بکا . وشەی لێکدراوی (زارهەراش) کە دەشێ بکرێتە (زارهەراشی) بۆیەیە چونکە وصفە هەرچەند بارگرانیشە - بە تەعبیری نوسەری وتار - . ئەم سوفیکسە ئەگەر ئازایە با وشەی (کەندەمە) کە ناوی مەلێکە بکاتە ئەبستراکت لە حالێکدا وشەی (کەندسم) کە وصفە و اسم فاعلی لێکدراوە دەشێ بە پێی دەستور ببێتە (کەندمی - وەك دارتاش کە دەبێتە دارتاشی) . کەندەمە کە ناوی مەلە و وصف نیە هەرگیز سوفیکسی (تی) قبوڵ ناکات .

بە سرنج گرتن دەردەکەوێت پێوەندی نێوان حرۆف بە زۆری ، ئەگەر نەڵێم هەمیشەکات ، لە رێی (ایەتی)وە دەبێتە ئەبستراکت

وەك ( خزمایەتی ، دۆستایەتی ، دوژمنایەتی ، خوشکایەتی ، پوورایەتی ، مەردایەتی .. بە دوا ئەوانیشدا کوردایەتی ، عەرەبایەتی ، تورکایەتی و هەمۆ ناوی ئەبستراکت لە ناوی میللەتانەوە وەرگیرابێت ) . وشـەی ( دۆست و دوژمن ) کە دەشێ ببنە ( دۆستی ، دوژمنی ) لەبەر لایەنی وصفیتەکەیە کە تێیانـــدایە ، ئەوساش واتای ( العـداوة )ی مطلق دەگەیەنێ ، کە ویسترا ( عداوە )ی نێوان دوٚ کەس باس بکرێ باشتر و راستتر ئەوەیە بگوترێ ( دوژمنایەتی بارام و دانا ـ وەیا دۆستایەتی نێوانیان ) . وشەی ( باوکەتی ، دایکەتی ) کە ( باوکایەتی ، دایکایەتی ) نین بۆیەیە ، لە وشەکاندا دەنگی ( ا ) هەیە ( باوك ، دایك ) لە حاڵی وەهادا بە عادەت ( ا )ی سوفیکسی ( ایەتی ) دەسـوێ کە ئەمە قاعیدەیێکە لە کوردیدا . کە هات و کۆتایی وشـە ( ا ) بوٚ ئیتر بە ناچاری دەبێ یەکێك لە دوٚ ( ا ) کە تێ بچێت وەك ( برا + ایەتی = برایەتی ) . ئەمانە لە گوتارەکەی ( بەکارهێنانی « ی » ) دا روٚن کراونەوە .

باسی دروست کردنی ناوی ئەبستراکت گەلێك لەوەی زیاتر بەبەرەوەیە کە لەم گوتارەدا و بە هۆی تاکە سـوفیکسی ( تی )ەوە نوٚسراوە ، بێ گومان لە نرخاندن و رەخنە لێ گرتندا جێی نابێتەوە .

لیستەی نموونەکانی لاپەڕەی دوایی لە لزوم زیاترن . خوێنەری گۆڤاری کۆڕ خوێنەری سەرەتایی نین پێویستیان بەلیستەی درێژ هەبێت .

[ نرخێنەر ]

پاش ئەوەی کە زانیمان ناوی ئەبستراکتی لە زمانی فارسی تازەدا بە یارمەتی سوفیکسی (ی) دروست دەکرێت ، بۆ ئەوەی لێکۆڵینەوەکەمان زیاتر بە سوود بێت ، دێینە سەر باسی چۆنێتی دروست کردنی سیفەتی نیسبی لە زمانی فارسی ناوەڕاستدا و پاشان لە زمانی فارسی تازەدا و لە دوای ئەوە دێینە سەر باسی چۆنێتی دروست کردنی ناوی ئەبستراکتی و سیفەتی نیسبی لە زمانی کوردیدا ، ئەویش پاش ئەوەی هەرسێ زمانەکە وانە ، زمانی فارسی ناوەڕاست و زمانی فارسی تازە و زمانی کوردی لەم بارەیەوە بەراورد دەکەین .

## چۆنێتی دروست کردنی سیفەتی نیسبی
## لە زمانی فارسی ناوەڕاستدا

لە زمانی فارسی ناوەڕاستدا سیفەتی نیسبی بە یارمەتی سوفیکسی (ئیك îk )[*] دروست دەکرێت . پرۆفیسۆر (زالیمەن) ئەسڵی ئەم سوفیکسە دەباتەوە سەر سوفیکسێکی ئێرانی کۆن (یاکە yake )[10] . لە دوای ئەوە چەند نموونەیەکی سیفەتی نیسبی هێناوەتەوە کە لە زمانی فارسی ناوەڕاستدا بە یارمەتی سوفیکسی (ئیك îk ) دروست کراون وە ئەمەش هەندێکە لەو نموونانە :

(*) سوفیکسی (ئیك îk ) لە حەرفی یای دەنگدار و حەرفی (ك) پێك هاتوە .

(١٠) بەشێك لە فیلۆلۆجی ئێرانی (بەرگی یەکەم) ، س زالیمەن ، فارسی ناوەڕاست ، ستراسبورگ ، ١٨٩٥ ـ ١٩٠١ ، ل. ٢٧٩

| وشــە | سوفیکس | سیفەتی نیسبی | بەکوردی |
|---|---|---|---|
| ئــەوار | ئیك | ئەواریك | دره‌نــگ |
| فریوەن | ئیك | فریوەنیك | فێڵباز |
| تۆڤان | ئیك | تۆڤانیك | بەتوانا |
| پیش | ئیك | پیشیك | ئەو کەسەی یاخود ئەو شتەی دەکەوێتە پێشەوە |
| پارس | ئیك | پارسیك | فارسی |

هەروەها پرۆفیسۆر (رەستەرگویڤا)ش باسی سوفیکسی (ئیك) دەکات کە چۆن لە زمانی فارسی ناوەڕاستدا سیفەتی نیسبی دروست دەکات وە هەندێك نمونەشی هێناوەتەوە لەوانە :

| وشــە | سوفیکس | سیفەتی نیسبی | بەکوردی |
|---|---|---|---|
| نـام | ئیك | نامیــك | بەناوبانگ |
| ئەفزۆن | ئیك | ئەفزۆنیك | شتێك کە بە شێوەیەکی زۆر یاخود فراوانــ هەبێت |
| دانیشن | ئیك | دانیشنیك | ئەو شتەی کە دەزانرێ یاخود پێویستە بزانرێت |

[ رەخنە :

لێرەشدا پاشگری (ئیك) هەڵەیە و دەبێ بنوسرێ (یك) بـا

له خوێندنه‌وه وه‌یا گوتنه‌وه‌شدا بگوترێ (ئیك) به هۆی ئه‌وه‌وه که زۆرێن له سه‌ره‌تای وشه‌وه نه دێت و نه تلفظی پێ ده‌کرێت . له صیغه‌ی نیسبه‌تدا چونکه به دوا وشه‌دا دێت هێنانی هه‌مزه‌یێکی زه‌ق له لاوه بۆ سه‌ره‌تای پاشگره‌که کارێکی نابه‌جێیه وه‌ك ئه‌و چه‌تره‌ی له رۆژی بێ هه‌ور و باران هه‌ڵی‌ده‌یت .

نمونه‌کانی رون کردنه‌وه‌ی مه‌به‌ستیش له پێویست درێژترن : له‌و خه‌ڵقه‌ی گۆڤار ده‌خوێننه‌وه وه‌یا مل ده‌ده‌نه باسی وشه‌سازی به‌یه‌ك دوو نمونه دابین ده‌بن ئه‌وه‌ی دێته به‌ر چاو له‌م گوتاره‌دا ئه‌مه‌یه که به‌شی هه‌ره زۆری لیسته‌ی نمونه‌کان له پێویست درێژترن .

[ نرخێنه‌ر ]

ئینجا دێینه سه‌ر ئه‌وه‌ی بزانین سیفه‌تی نیسبی له زمانی فارسی تازه‌دا چۆن پێك دێت .

چۆنێتی دروست کردنی سیفه‌تی
نیسبی له زمانی فارسی تازه‌دا

له زمانی فارسی تازه‌دا سوفیکسی (ی î) که پێی ده‌ڵێن (یای نیسبه‌ت) ده‌چێته سه‌ر جۆره‌ها وشه و ده‌یانکات به سیفه‌تی نیسبی . پرۆفیسۆر (ڤۆن پاول) ده‌ڵێت که ئه‌م یای نیسبه‌ته ئه‌سڵه‌که‌ی له سوفیکسی (ئیك ik)ه‌وه هاتوه که له زمانی فارسی ناوه‌ڕاستدا سیفه‌تی نیسبی دروست ده‌کرد[١٦] . پاشان چه‌ند نمونه‌یه‌کی سیفه‌تی

(١٦) به‌شێك له فیلۆلۆجی ئێرانی ( به‌رگی یه‌که‌م ) ، پاول هۆرن ، زمانی=

نیسبی لە زمانی فارسی تازەدا هێناوەتەوە و یەکسەر بەراوردی کردوە لەگەڵ زمانی فارسی ناوەڕاستدا لەو نموونانە :

| زمانی فارسی تازە | | | زمانی فارسی ناوەڕاست | | |
|---|---|---|---|---|---|
| وشە | سوفیکس | سیفەتی نیسبی | وشە | سوفیکس | سیفەتی نیسبی |
| دێن | ی | دینی | دێن | ئیك | دینیك |
| کار | ی | کاری | کار | ئیك | کاریك |
| ئێرانشەهر | ی | ئێرانشەهری | ئێرانشەتر | ئیك | ئێرانشەتریك |

هەروەها ئەم نموونانەی تریشی لە زمانی فارسی تازەدا هێناوەتەوە : کاشی ، کوفی ، بەنگالی ، مازندەری .

پرۆفیسۆر ( پێیسیکۆف )یش سوفیکسی ( ی î ) یاخود یای نیسبەت لە زمانی فارسی تازەدا بە ئەسڵ دەباتەوە سەر سوفیکسی ( ئیك îk )[17] ، وە لەسەر ئەو رایەشە کە گوایە حەرفی ( ی ، ك ) لە وشەی ( تاریك ، نەزدیك ) پاشماوەی سوفیکسی ( ئیك îk ) ە ، وانە سوفیکسی ( ئیك îk ) هەتا ئێستا لەو دوو وشەیەدا خۆی پاراستوە و بوە بە بەشێك لێیان . لە پاش ئەوە پێیسیکۆف سوفیکسی ( ی ) بە سوفیکسێکی زۆر بەرهەمدار دادەنێت لە زمانی فارسی تازەدا کە

= تازەی نوسینی فارسی ، ستراسبورگ ، ۱۸۹۵ز – ۱۹۰۱ ، ل. ۱۷۹

(۱۷) ل. س. پێیسیکۆف ، دیراساتی وشەسازی لە زمانی فارسیدا ، مۆسکۆ ، ۱۹۷۳ ، ل. ۱۸۳

دەچێتە سەر کۆمەڵێکی یەجگار زۆر لە وشەی جیاواز و سیفەتی نیسبییان لێدروست دەکات ئەمەش هەندێکە لەو نمونانەی کە پرۆفیسۆر پێیسیکۆف هێناوینێتەوە :

| وشە | سوفیکس | سیفەتی نیسبی | بەکوردی |
| --- | --- | --- | --- |
| کەتاب | ی | کەتابی | کتێبی |
| خەجالەت | « | خەجالەتی | شەرمن |
| سلارمە | « | سلارمەیی | شینێکی تێر |
| نۆقرە | « | نۆقرەیی | زیوی |
| جەنگ | « | جەنگی | جەنگی |
| هنر | « | هنری | هونەری |
| یەک نەفەر | « | یەک نەفەری | یەک نەفەری ( یەک کەسی ) |
| چهارسەدفەرەق | « | چهارسەدفەرەقی | چوارسەدلاپەڕەیی |
| پەنجاون | « | پەنجاوی | پێنجەنی |
| شیراز | « | شیرازی | شیرازی |

[ رەخنە :

بەلای منەوە دەتوانرا بە کورتی بگوترابا جوداوازی نێوان فارسی تازە و ناوەڕاست ئەوەیە لە فارسی تازەدا دەنگەکەی ( ك ) لە سوفیکسەکە سواوە . ئەم یەک دوو گوتەیەش هەر دەخرایەوە کۆتایی سەرە باسی پێشوتر لەگەڵ نەختێک گۆڕینی سەرەباسەکە تاکو هەردوو

لاباسەکان بگرێتەوە ، چی هەشبێ لە رای پرۆفیسۆرەکان ـ کە دیارە یەك رایان هەیە ـ بەکورتی باس دەکرا . لیستە دە وشەییەکەی پرۆفیسۆر (پێیسیکۆڤ)یش ، جگە لە درێژی زیاد ، لە تحصیل حاصلێك پتر نیە .

دوو وشەی (تاریك ، نزدیك) تا ئێستا ئەسلەکیان کە (تار ، نزد)ە هەر لە کاردایە ، بەو پێیە دیارە پاشگرەکەی (یك) نەبوە بە بەشێك لێیان ئەگەر مەبەس لە (بەش) ئەوەبێ کە نەشێ لە وشەکە جودابێتەوە . خۆ ئەگەر مەبەس ئەوەبێ بڵێین پاشگرەکە ماوە لەم دوو وشەیەدا ، خۆ ئەوەمان گوتوە و لێی بوێنەتەوەش .

لە کوردیی وشەیتر هەیە لەم بابەتە ، یەکێکیان وشەی (پەلیك ـ لە هەندێ جێگە پێی دەڵێن هەلوك) کە لە (پەل) وەرگیراوە . پەل بەو دارە باریکە دەڵێن سەرەکەی بە مائیلی بڕابێ ، پەلیکیش هەر ئەو دارەیە سەرەکەی پەل کراوە و لە (پەلیکانێ)دا بە (دەسپەل ـ دەستپەل ـ دەستپەلیك) بەرەو مەیدانی یاریەکە لێی دەدەن . (دەسپەل) ئەویش دیارە لە (پەلیك) وەرگیراوە وەك (دەسکەلا) لە (کەلا) وەرگیراوە .

تێبینیەکی تریش دێتە سەر لیستەکان لەوەدا کە هەمویان لە دیراسەی زانای غەیری فارسەوە وەرگیراون . وا دەزانم زمانزانی فارس لە هی بێگانە پتر خەریکی فارسی بون و بەرهەمیشیان زۆرە . دیتنی ئەو بەرهەمانە یەکجار (نەك یەجگار کە نوسەری گوتار و

گەلێك له نوسەرانیتری سلێمانی بەکاری دێنن ) پێویسته بۆ یەکێك بیەوێت له فارسی شارەزابێت . لەگەڵ ئەمەشـدا دەبێ ئەو عوزره له نوسەری گوتار بسەلمێنم کە خوێندنەکەی رۆسییه و له رۆسیایه ، هێنده هەیه نابێ مرۆڤ زیهنی خۆی له چارچێوەی کتێبی خوێندنی رەسمیدا گیرۆده بکات ، هێنانەوەی نمونەی رۆن کردنەوەی مەبەسیش ئەو ئەرکە زەحمەته نیە کە نوسەر هەمو جاران تێیدا هانا بباته بەر مامۆستای دەرەوەی زمانەکـه .

[ نرخێنەر ]

پاشی ئەوەی کە زانیمان چۆن ناوی ئەبســتراکتی و سیفەتی نیسبی له زمانی فارسی ناوەڕاست و فارســی تازەدا چۆن دروست دەکرێت ، ئێســتا دێین لەگەڵ چۆنێتی دروست کردنی ناوی ئەبستراکتی و سیفەتی نیسبی له زمانی کوردیدا بەراورد دەکەین .

وەك ئاشـکرایه زمانی کوردی یەکێـکه له زمانه ئێرانیـکان و ســەر به خێزانی زمانه هندو ئەوروپیـکانه ، لەگەڵ ئەوەدا کە هەر زمانێك له زمانه ئێرانیـکان خاوەنی گراماتیکی تایبەتی خۆیەتی کە بەوه جیا دەکرێتەوه له زمانه ئێرانیـکانیتر و دەیـکات به زمانێـکی سەربەخۆ ، بەڵام له نێوان هەمــو زمانه ئێرانیـکاندا له رۆی گراماتیکەوه جا چ له رۆی مەرفەلۆژیا ، یا فۆنەتیکەوه ، یا سینتێکسەوه ، یا وشه سازییەوه لێك چوین و نزیکیەکی تەواو هەیه ، ئەمەش لەبەر ئەوەیه یەکەم ئەم زمانه بەرەی یەك خێزانن و ئەسلی هەر یەکێکیان

دەگەڕێتەوە بـۆ یەك زمان ، هەر لەبەر ئەمە دەبینین پەیوەندی و خزمایەتییەکی تەواو لە نێوان ئەم زمانانەدا هەتا ئێستا هەیە .

بۆ نموونە ئەگەر سەیری وشە سازی لە زمانە ئێرانیێکاندا بکەین ، دەبینین بە گشتی لە هەمـــو ئـەم زمانانەدا یەکێك لە رێـگەکانی وشە سازی بـــە یارمەتی سوفیکسە . ئەگەر بێتــو سەرنجێك لەو سوفیکسانەی کە لەم زمانانەدا هەیە بدەین ، بۆمان دەردەکەوێت کە بەشێکی زۆر لەو سوفیکسانە لە ناو ئـــەم زمانانەدا هاو بەشن ، واتە لە هەموو زمانە ئێرانیێـکاندا بەکار دێن ، بەڵام لەبەر ئەوەی کە هەر زمانێك لەم زمانانە وەك وتمان سەربەخۆن و خاوەنی گراماتیـکی تایبەتی خۆیانن ، دەبینین هەر زمانێك خاوەنی کۆمەڵێك سوفیکـسە کە تەنها تایبەتییە بەو زمانەوە ، واتە لە زمانە ئێرانیێکانی تردا نییە . هەروەها جاری وا هەیە لەگەڵ ئەوەدا کە هەنـدێ سوفیکس وەك وتمان هاوبەشن لەم زمانانەدا ، بەڵام لە ڕوی فۆرمەکانیانەوە یاخـود ئەو رۆڵەی کە لەمەیدانی وشە سازیدا دەیبینن جیاوازن ، یان ئەگەر تەماشای سوفیکـسێك لەو سوفیکسانەی کە هاوبەشن لە نێوان زمانە ئێرانیێکاندا بکەین ، بۆمان دەردەکەوێت کە لە زمانێـکیاندا زۆر بەرهەمدارە و دەچێتە سەر کۆمەڵێـکی زۆر لە وشـــە و بە بەردەوامی و بە بێ وەستان رۆڵی تایبەتی خۆی لە مەیدانی وشە سازیدا دەبینێت ، کەچی لەوانەیە هەر ئەو سوفیکسە لە زمانێکی تریاندا لە کاتێـکی دیاری کراودا لە مەیدانی وشـــە ســـازیدا رۆڵێـــکی

بەجگار زۆری بچێنێت ، بەڵام بەرەبەرە له مەیدانی وشه ســـازیدا ڕۆڵەکەی کز بوه یان هەر بەتەواوی ڕۆڵی نەماوه و سوفیکسی‌تر جێگەی گرتۆتەوە .

[ ڕەخنه :

چی له بارەی لەیەك چوونی وشـەسازی‌زمانه ئێرانیەکانەوه لێرەدا باس کراوه مەعلوماتێکی باوه و زوربـەی خوێنەران دەی‌زانن ، هەروەهاش خزمایەتی نێوان ئەم خێزانه و خێزانی هیندو ئەورووپاییەکان (وشەی ئەورووپیەکان که نوســەر بەکاری دێنێت ترکیبێکی عەرەبییه وەك وشەکانی ئەمریکی و ئەفریقی و ئاســیەوی که کوردییەکەیان ئەمەریکایی و ئەفریقایی و ئاسیایی‌یه) . سەرەڕای ئەمـه ، ڕواڵەتی نوسینەکه وا رادەگەیەنێ که ئەم سوفیکسانه تایبەتی زمانه ئێرانیەکان وەیا هیندوئەورووپاییەکانن ، کەچی له زمانێکی وەك عەرەبیدا سوفیکسی نیسبەت هەیه و له هەمان کاتدا دەنگی (ی)یه وەك زمانەئێرانیەکان ، هەر ئەوەندەی فەرقه که له عەرەبیدا (ی)که گوشـــراوه بەڵام وا دەبێ گوشینەکەش دەڕوا و تەنها (ی) دەمێنێتەوە :

صـــونی جمالك عنا اننـــا بشر
من التراب و هذا الحسـن روحانی

جگه له شیعر له وەقفەشدا (ی)که گوشینی لەســەر هەڵدەستێ وەك (انت بغدادی ـ هذا البساط کاشانی ...) .

نوسەر وشەی (هاوبەش) بە واتای (مشترك) بەکار دێنێت که

لە راستیدا واتاکەی (شریك)ە ، لەمەشدا شوێن پێی تۆسەرانی تری کوردی هەڵگرتۆتەوە کە لە پێش ئەودا سەهوویان کردوە لە بەکار هێنانی وشەکە .

] نرخێنەر [

لەو سوفیکسانەی کە لە هەمو زمانە ئێرانیەکاندا هاوبەشن سوفیکسی ( ی î )ی ناوی ئەبستراکتی و سوفیکسی ( ی î )ی سیفەتی نیسبییە . وەك زانیمان ناوی ئەبستراکتی لە زمانی فارسی ناوەڕاستدا بە یارمەتی سوفیکسی ( ئیه îh ) دروست دەکرا ، هەروەها لە زمانی فارسی تازەدا بە یارمەتی سوفیکسی ( ی î ) کە بەفارسی پێی‌دەوترێت یای مەسدەری دروست دەکرا ، پاش ئەوە زانیمان کە ئێراننناسەکان ئەو سوفیکسی ( ی )یەی کە لە فارسی تازەدا یای مەسدەری پێ‌دەوترێت بە ئەسڵ بردەوە سەر سوفیکسی ئێرانی کۆن ( ئیه îh )کە وەکو بینیمان لە زمانی فارسی ناوەڕاستدا ئەم سوفیکسی ( ئیه )ە ناوی ئەبستراکتی دروست دەکرد . بۆ ئەوەی بزانین کە سوفیکسی ( ی î ) لە زمانی کوردیدا کە دەبێت بە هۆی دروست کردنی ناوی ئەبستراکتی ئەسڵەکەی لە کوێوە هاتوە و ئەو گۆڕانانەی کە تا ئێستا بەسەریدا هاتوە چین ؟ دێین چەند نمونەیەکی ناوی ئەبستراکتی لە زمانی فارسی ناوڕاستدا کە بە یارمەتی سوفیکسی ( ئیه ) پێك هاتون لە ڕوی مەعنا و فۆرمەوە لەگەڵ زمانی فارسی تازە و زمانی کوردیدا بەراورد دەکەین ، پاشان بە تەنها چەند

نموونەیەکی ناوی ئەبستراکتی لە زمانی فارسی تازەدا کە بە یارمەتی سوفیکسی (ی ī) دروست کراون بەراورد دەکەین لەگەڵ زمانی کوردیدا بۆ ئەوەی بزانین جیاوازی و لەیەک چوون لە رووی فۆرم و مەعناوە لە نێوانیاندا هەیە یاخود نە ؟

| فارسی ناوەڕاست | فارسی تازە | کوردی |
|---|---|---|
| راستیه | راستی | راستی |
| شادیه | شادی | شادی |
| تاریکیه | تاریکی | تاریکی |
| فەتیه | بەدی | بەدی |
| دوستیه | دوستی | دۆستی |
| پاتخشاهیه | پادشاهی | پادشایی |

ئەمەش چەند نموونەیەکی تری ناوی ئەبستراکتییە لە زمانی فارسی تازە و زمانی کوردیدا :

فارسی تازە(*)

| وشە | سوفیکس | ناوی ئەبستراکتی |
|---|---|---|
| زرد | ی | زردی |

(*) ئەم نموونانەی فارسی تازەمان لەکتێبی فارسییەوە وەرگرتوە ، لەبەر ئەوە هەر بەو ئیملایە نوسیمانەوە ، بەڵام بۆ ناوە ئەبستراکتێکانی فارسی تازە سوفیکسەکەمان بە ئیملای کوردی نوسیوە ئەویش بۆ ئەوەی کە خوێنەری بەرێز بزانێت کە ئەو یای مەسدەرییە ، یایەکی دەنگدارە چ لە فارسی تازە داو چ لە کوردیدا .

| | | |
|---|---|---|
| دشمن | « | دشمنی |
| دلسوز | « | دلسوزی |
| بی‌عار | « | بی‌عاری |
| باغبان | « | باغبانی |
| پزشك | « | پزشکی |
| دلخوش | « | دلخوشی |
| دزد | « | دزدی |
| دولتمند | « | دولتمندی |

## کوردی

| وشە | سوفیکسی | ناوی ئەبستراکتی |
|---|---|---|
| زەرد | ی | زەردی |
| دوژمن | « | دوژمنی ( دوژمنایەتی ) |
| دڵسۆز | « | دڵسۆزی |
| بێعار | « | بێعاری |
| باخەوان | « | باخەوانی |
| پزیشك | « | پزیشکی |
| دڵخۆش | « | دڵخۆشی |
| دز | « | دزی |
| دەوڵەمەند | « | دەوڵەمەندی |

سەرنجدانێکی ورد له ناوە ئەبستراکتێکانی هەر سێ زمانەکە، دەمانگەیەنێتە ئەو راستییەی کە لە رۆی مەعناوە لە هەرسێ زمانەکەدا، بە شێوەیەکی گشتی یەك مەعنا دەبەخشن. بۆ سەلماندنی راکەشمان چەند ناوێکی ئەبستراکتی لە هەرسێ زمانەکەدا هەڵدەبژێرین و بەراوردیان دەکەین، تابزانین لە رۆی مەعنا و پێكهاتنیانەوە جیاوازییان هەیە یاخود نە. ؟ .

[ رەخنە :

لەم چەند لاپەڕەیەی دواییدا لیستەکان درێژەیان لە حەد بەدەر بۆ، کاکڵی بیروباوەڕەکانیش گەلێك زۆتر لە درێژەکێشانی لیستەکان و شی کردنەوەیان خۆیان بەدەستەوە داوە. هەمان درێژەکێشان لە لاپەڕەکانی لێرە بەدواوەش دێتە بەر هەست.

من لە راپۆرتەکەی خۆمدا کە بۆ ئەنجومەنی کۆڕم نوسی بۆ لە بارەی ئەم گوتارەوە دەرم بڕی بۆ کە ئەگەر خاوەنی گوتار رازی بێ چارەسەر کردنی ئەم درێژەیە کارێکی ئاسانە چونکە لە نێوان فەرمانبەرانی کۆڕدا خۆیندەوار و رۆشنبیری ئەوتۆ هەیە بتوانێ بە دڵی خاوەن گوتار پوختەیێکی وەهای ئەو لاپەڕانە بنوسێ تۆسقاڵێك لە مادەی گوتارەکە بە فیڕۆ نەدات. بە داخەوە ئەم پێشنیارە لە خۆوە وەك بەفری بەر هەتاو چۆوە لە ئاکامی هاتنەوەی وەرامی خاوەن گوتار بەو جۆرەی لە سەرەتای پێشەکیدا رۆن کرایەوە.

هەست دەکەم بەوە کە سەرلەبەری گوتارەکە لە ورد پێوان و

شیکردنەوەی بە زیادەوە و لیســـتەهۆنی نمونانەدا ، وەك مامۆستای قوتابخانەی بێســـەوادان ، ئەوپەڕی ئیحتیمالی نابەڵەدتی خوێنەرانی کوردتی رەچاو کردوە و لەبەر تیشکی ئەو ئیحتیمالەدا بە زمانی ساوایان لەگەڵیاندا دەدوێت . خۆماندو کردنەکە جێی سپاســـە ، بەڵام خوێنەرانی کوردتی هێندە پێویستیان نەماوە بە حینجەبی کردنەوەی بابەتی وەك هی ئەم گوتارە ـ دەڵێم حینجەبی کردنەوە ناڵێم دوانی عادەتی ـ .

نرخێنەر

جارێ لە روی مەعناوە بۆ نمونە وشەی (راستیھ) لە فارسی ناوەڕاستدا ، (راستی) لە فارسی تازەدا ، (راستی) لە کوردیدا ، لە هەرسێ زمانەکەدا یەك مەعنا دەبەخشن ، هەروەها بە نیســـبەت وشەی (شادیھ) لە فارسی ناوەڕاستدا ، (شادی) لە فارسی تازەدا ، (شادی) لە کوردیدا یەك مەعنا لە هەرسێ زمانەکەدا دەبەخشـــن ، هەروەها وشەی (پاتخشاهیھ) لە فارسی ناوەڕاستدا ، (پادشـاهی) لە فارسی تازەدا ، (پادشایی) لە کوردیدا ، لە هەرسێ زمانەکە یەك مەعنا دەبەخشن . بەم جۆرە هەر نمونەیەکیتر هەڵبژێرین لە فارســی ناوەڕاستدا و لەگەڵ فارسی تازە و کوردیـدا بەراوردی بکەین دەبینین بە شێوەیەکی گشتی لە هەرسێ زمانەکەدا ناوی ئەبستراکتین و یەك مەعنا دەبەخشن ئەمە لە روی مەعنـــاوە ، لە روی چۆنێتی پێك هێنانیانەوە ئەگەر لێیان ورد بینەوە دەبینین هەمدیسان لە

هەرسێ زمانەکەدا بە یەك چەشن پێك هاتوون .

بۆ نموونە : وشەی ( راستیه ) لە فارسی ناوەڕاستدا لە وشەی ( راست ) کە سیفەتە لەگەڵ سوفیکسی ( ئیه ) پێکهاتوە ، وشەی ( راستی ) لە فارسی تازەدا لە وشەی ( راست ) کە سیفەتە لەگەڵ سوفیکسی ( ی ) پێکهاتوە ، هەر بەو جۆرە وشەی ( راستی ) لە کوردیدا لە وشەی ( راست ) کە سیفەتە لەگەڵ سوفیکسی ( ی ) پێکهاتوە هەروەها وشەی ( پاتخشاهیه ) لەفارسی ناوەڕاستدا لە ( پاتخشاه ) کە ناوە لەگەڵ سوفیکسی ( ئیه ) پێك هاتوە ، وشەی ( پادشاهی ) لە فارسی تازەدا لە وشەی ( پادشاه ) کە ناوە لەگەڵ سوفیکسی ( ی ) پێك هاتوە ، وشەی ( پادشایی ) لە کوردیدا لە وشەی ( پادشا ) کە ناوە لەگەڵ سوفیکسی ( ی ) پێك هاتوە . بەم جۆرە دەبینین هەمو ناوە ئەبستراکتیێکانی تریش لە هەرسێ زمانەکەدا لە ڕوی چۆنێتی پێك هاتنیانەوە بە شێوەیەکی گشتی بە یەك چەشن پێك هاتوون .

جا ئێستا ئەگەر بێتو تەنها بەراوردی ناوە ئەبستراکتێکانی فارسی تازە و کوردی بکەین دەبینین ، بە شێوەیەکی گشتی بە یەك چەشن پێك هاتوون وە لە ڕوی مەعناوە لە هەردوو زمانەکەدا ئەو وشانەی کە لە فارسی تازەدا بە یارمەتی سوفیکسی ( ی ) و لە کوردیدا بە یارمەتی سوفیکسی ( ی ) کراون بە ناوی ئەبستراکتی ، جا لە هەردوو زمانەکەدا ئەو وشانە مەعنایەکی ئەبستراکتی دەبەخشن

بۆ نمونە : وشەی ( زرد ، دشمن ، باغبان ، دلخـــوش ، دزد ) لە فارسی تازەدا لەگەڵ وشەی : ( زەرد ، دوشمن ، باخەوان ، دڵخۆش ، دز ) لە کوردیدا ، یەك مەعنا دەبەخشن هەروەها ( زردی ، دشمنی ، باغبانی ، دلخوشـــی ، دزدی ) لە فارسی تازەدا وە ( زەردی ، دوشمنی ، باخەوانی ، دڵخـــۆشی ، دزی ) لە کوردیدا ناوی ئەبستراکتین و یەك مەعنا دەبەخشن .

وەکو زانیشمان ئێرانناسەکان سوفیکسی ( ی ) یاخـــود یای مەسدەری لە فارسی تازەدا بە ئەسڵ بردەوە سەر سوفیکسی ئێرانی کۆن ( ئیھ ih ) ئەوی شایانی باسە سوفیکسێکی کۆنی ئێرانییـە وە موڵـکی هەموو زمانە ئێرانیێکانە وە زانیشمان بە یارمەتی ئەم سوفیکسە ناوی ئەبستراکتی لە زمانی فارسی ناوەڕاستدا دروســت دەکـرا کەواتە ئەسڵی سوفیکسی ( ی ) لە فارسی تازەدا ئاشکرا و دیارە و زانراوە ، ماوەتەوە سەر زانینی ئەسڵی سوفیکسی ( ی ) لە زمانـــی کوردیدا کە ناوی ئەبستراکتی دروست دەکات .

کاتێك کە ناوە ئەبســـتراکتێکانی زمانی فارسی ناوەڕاست و فارسی تازە و کوردیمان لە ڕوی مەعنا و چـــۆنێتی پێك هاتنیانەوە بەراورد کرد ، گەیشتینە ئەو ئەنجامەی کە ئەو ناوە ئەبستراکتییانە لە هەرسێ زمانەکەدا مەعنایەکی ئەبستراکتی دەبەخشن و بە شـێوەیەکی گشتیش بە یەك جەشن پێك هاتـــون . کەواتە سوفیکسی ( ئیھ ) لە زمانی فارسی ناوەڕاستدا و سوفیکـسی ( ی ) یاخود یای مەسدەری لە

فارسی تازەدا و سوفیکسی (ی) له کوردیدا یەك مەعنا دەبەخشن و بە گشتی یەك رۆڵ له مەیدانی وشەسازیدا دەبینن ، کەواتە خاوەنی یەك ئەسڵن بەم جۆرە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە ئەسڵی سوفیکسی (ی) لە زمانی کوردیـدا کە ناوی ئەبستراکتی دروســـت دەکات دەگەڕێتەوە بۆ سوفیکسی ئێرانی کۆن (ئیھ îh) هەروەك چـون ئەسڵی سوفیکسی (ی) یاخود یایمەسدەری دەگەڕێتەوە بـۆ هـەمان سوفیکس ، واته (ئیھ îh ) .

باشـــە بۆچی فۆرمی سوفیکسی (ئیـھ) له زمانی کوردی و فارسی تازەدا گۆڕاوه و بوه به (ی) ؟ واته بۆ چی حەرفی (ھ) له زمانی کوردی و فارسی تازەدا فڕێی دراوه ؟ حەرفی (ھ h) له زمانی کوردیدا بە تایبەتی لەبەر ئەوەی کە حەرفێکی بـێ دەنـگی بێ هێزە زۆر جار له کاتی قسەکردندا له ئەنجامی بەرەوپێش چـونی زمان و دەربڕینی هەستی ئادەمیزاد بە کورترین شێوە ، یان بـە تەواوی فڕێی دەدرێت ، یاخـــود تەلەفوز ناکرێت ، بەتـایبەتی کە دەکەوێتە کۆتایی وشەوە بۆ نموونە :

له زمانی کوردیدا وشەی [ ده ( ۱۰ ) ] کاتی خۆی ( دەھ deh )بوه وشەی ( پەنجا ) کاتی خۆی ( پەنجاھ ) بوه ، وشەی ( پانزده ) کاتی خۆی ( پانزدەھ ) بوه ، وشەی ( نیگا ) کاتی خۆی ( نیگاھ ) بوه ، وشـەی ( مە )(*) له کرمانجی ســەرودا کاتی خۆی ( مەھ )بوه ، هەروەها

(*) مه = مانـگ

سوفیکسی ( گا ، گە ) کاتی خۆی ( گاھ ، گەھ )بوە .. هتــد وەك لەم نمونانەدا بینیمان حەرفی (ھ) یان بــە تــەواوی فڕێی دراوە یاخود بە ئاستەم تەلەفوز دەکرێت ، کەواتە هەر بەم جۆرەش حەرفی (ھ) لە سوفیکسی ئێرانی کۆن (ئیھ ih) فڕێی دراوە یاخود بــە ئاستەم تەلەفوز دەکرێت و ماوەتەوە حەرفی (ی i ) واتــە حەرفی یای دەنگدار ، بەم چەشنە سوفیکسی (ی i ) کە لە زمانی کوردیدا ناوی ئەبستراکتی دروست دەکات پاشماوەی سوفیکسی ئێـرانی کۆن (ئیھ ih ) ە .

پاش ساغ کردنەوەی سوفیکسی (ی) کە لە زمانی کوردیدا ناوی ئەبستراکتی دروست دەکات ، ئێستا دێینە سەر لێکۆڵینەوە و ساغ کردنەوەی سوفیکسی (ی i ) کە لە زمانی کوردیدا سیفەتی نیـسبی دروست دەکات .

بۆ ئەم مەبەستە دێین چەند نمونەیەکی سیفەتی نیسبی لە زمانی فارسی ناوەڕاستدا ، کە بە یارمەتی سوفیکسی (ئیك ik) دروسـت دەکرا ، هەروەها چەند نمونەیەکی سیفەتی نیسبی لە زمانی فارسـی تازەدا ، کە بە یارمەتی سوفیکسی (ی i) یاخود یای نیسبەت دروست دەکری لەگەڵ زمانی کوردیدا بەراورد دەکەین ، جا بزانیـن دەگەینە چ ئەنجامێك

| فارسی ناوەڕاست | | | فارسی تازە | | |
|---|---|---|---|---|---|
| وشه | سوفیکس | سیفەتی نیسبی | وشه | سوفیکس | سیفەتی نیسبی |
| دین | ئیك | دینیك | دین | ی | دینی |
| پارس | « | پارسیك | پارس | ی | پارسی |

کوردی

| وشـه | سوفیکس | سیفەتی نیسبی |
|---|---|---|
| دین | ی | دینی |
| ئاین | | ئاینی |
| فارس | « | فارسی |

ئەمەش چەند نموونەیەکی‌تری سیفەتی نیسبییه له زمانی فارسـی تازه و زمانی کوردیدا :

فارسی تازه

| وشه | سوفیکس | سیفەتی نیسبی |
|---|---|---|
| هنر | ی | هنری |
| بهشت | « | بهشتی |
| جیهان | « | جیهانی |
| شیراز | « | شیرازی |
| ژاپۆن | « | ژاپۆنی |

| | | |
|---|---|---|
| سەدمەتر | » | سەدمەتری |
| پەنجتون | » | پەنجتونی |

کوردی

| وشە | سوفیکس | سیفەتی نیسبی |
|---|---|---|
| هونەر | ی | هونەری |
| بەهەشت | » | بەهەشتی |
| جیهان | » | جیهانی |
| شیراز | » | شیرازی |
| ژاپۆن | » | ژاپۆنی |
| سەدمەتر | » | سەدمەتری |
| پێنجتەن | » | پێنجتەنی |

سەیر کردنێکی وردی هەمو سیفەتە نیسبێکان لە هەرسێ زمانەکەدا ، ئەمان گەیەنێت بەو راستییەی کە هەر سیفەتێکی نیسبی لە هەر زمانێکیاندا هەڵبژێرین و لەگەڵ ئەوانی تردا بەراوردی بکەین ، واتە لە دو زمانەکەی تردا ، دەبینین لە رۆی مەعناوە لە هەرسێ زمانەکەدا سیفەتی نیسبین و بە گشتی یەك مەعنا دەبەخشن وە لە رۆی چۆنێتی پێك هاتنیانەوە بە شێوەیەکی گشتی بە یەك چەشن پێك هاتون .

بۆ نمونە : وشەی (دینیك ، پارسیك) لە فارسی ناوەڕاستدا ،

وشەی (دێنی ، پارسی) له فارسی تازەدا ، وشەی (دێنی ، فارسی) له کوردیدا ، سیفەتی نیسبێن و یەك مەعنا دەبەخشن .
هەروەها لە ڕوی چۆنێتی پێك هاتنیانەوە وەك یەك وان . بۆ نموونە :
وشەی (دینیك) لە فارسی ناوەڕاستدا لە (ناو + سوفیکسی « ئیك ») پێك هاتوە ، وشەی (دینی) لە کوردیدا لە (ناو + سوفیکسی « ی ») پێك هاتوە .

وەکو زانیمان کە سوفیکسی (ی) یاخود یای نیسبەت لە فارسی تازەدا بە ئەسڵ دەچێتەوە سەر سوفیکسی ئێرانی کۆن (ئیك îk) کە لە زمانی فارسی ناوەڕاستیشدا سیفەتی نیسبی دروست دەکرد ئێستا ماوەتە سەر زانینی ئەسڵی سوفیکسی (ی) کە لە زمانی کوردیدا سیفەتی نیسبی دروست دەکات . ئێمە لە کاتی بەراورد کردنی سیفەتە نیسبیەکانی فارسی ناوەڕاست و فارسی تازە و کوردیدا گەیشتینە ئەو ئەنجامەی کە لە ڕوی مەعنا و چۆنێتی پێك هاتنیانەوە وەك یەك وان ، کەواتە سوفیکسی (ئیك) لە فارسی ناوەڕاستدا ، سوفیکسی (ی) یاخود یای نیسبەت لە فارسی تازەدا هەروەها سوفیکسی (ی) لە کوردیدا یەك مەعنا دەبەخشن و یەك ڕۆڵ لە مەیدانی وشەسازیدا دەبینن ، کەواتە ئەسڵی هەر سێکیان یەکە .
بەم جۆرە سوفیکسی (ی) کە لە زمانی کوردیدا سیفەتی نیسبی دروست دەکات پاشماوەی سوفیکسی ئێرانی کۆن (ئیك îk)ە . باشە بۆچی فۆرمی سوفیکسی (ی) لە زمانی کوردی و فارسی تازەدا

لەگەڵ فۆرمی سوفیکسی (ئیك)دا جیاوازە ؟

زاهیرەی گۆڕینی حەرفێك بـــە حەرفێکی‌تر ، فـــڕێی دانی حەرفێك و زیادە کردنی حەرفێـــك یان چەند حەرفێکی‌تر بە نیسبەت هەمو زمانەکانی جیهانەوە شتێکی ئاسایی‌یە و لە هەمو زمانێکدا ڕوَ دەدات لەبـــەر ئەوە حەرف (ك k )لە سوفیـکـسی ئێرانی کۆنـــدا (ئیك îk) فڕێ دراوە حەرفی (ی î) ماوەتەوە کە تا ئێستا ئـــەو ڕۆڵەی سوفیکسی (ئیك îk ) لە مەیدانی وشەسازیدا دەبینی ئەمیش ، واتە سوفیکسی (ی î) چ لە زمانی کوردیدا و چ لە زمانی فارسی تازەدا هەر ئەو ڕۆڵەی سـوفیکسی (ئیك) لە مەیـدانی وشەسازیدا دەبینێت ، چونکە پاشماوەی سوفیکسی (ئیك îk )ە .

لە زمانی کوردیدا بۆ ئەو حاڵەتانەی کە لە هەنـــدێ وشـــەدا حەرفی (ك k ) فـــڕێ دراوە نمونەمان هەیە . بۆ نمونە با سەیری فۆرمی ئەم چەند سوفیکسە بکەین ، بزانین فۆرمی جاران چۆن بوە و فۆرمی ئێستایان چۆنە ؟

| سوفیکس کانی جارانی لە فارسی ناوەڕاستدا | | نمـونـــە |
|---|---|---|
| ئانەك | anek | مەرتانەك |
| ئـەك | ek | پانزدەسالەك |
| ئـاك | ak | داناك |

سوفیکس کانی ئێستای

| لـه کوردیدا | | نموونـــه |
|---|---|---|
| ئانه | ane | ژنانه ، پیاوانه |
| ه | e | پانزده ساڵه |
| ئا | a | زانا |

هەروەها له کرمانجی سەرۆدا حەرفی (ك) له وشـــەی (بەریك) فڕێ دراوه و بوه به (بەری)[18]*

کەواته هەر بەم شێوەیه حەرفی (ك)ی سوفیکسی ئێرانی کۆن (ئیـك îk) فـــڕێ دراوه و (ی î) ماوەتـــەوه که ئێستا له زمانیکوردیدا سیفەتی نیسبی دروست دەکات .

بـەم جـــۆره بۆمان دەرکەوت که له زمانی کوردیـدا دوَ سوفیکسمان هەیه فۆرمەکانیان له یەك دەچێت ، بـەلام له راستیدا دوَ سوفیکسی جیان و ئەسڵیان جیایه و هەریەکه رۆڵی تایبـــەتی خۆی له مەیـــدانی وشەسازیدا دەبینێت دوَ سوفیکسەکەش کەوەك زانیمان ئەمانەن :

١ ـ سوفیکسی (ی î ) که ناوی ئەبستراکتی دروسـت دەکات و به ئەسڵ دەچێتەوه سەر سوفیکسی ئێرانی کۆن (ئیھ îh) .

(١٨) ك. ك. کوردۆیێف ، له بارەی ماناو وەزیفەی سوفیکی ( ـ ك د ئەکه ، ) ، [ دیراسەی مێژوّی کەلچەری نەتەوەکانی رۆژهەلاَت ، مۆسکۆ ـ لینینگراد ، ١٩٦٠ ، ل. ٣٦٨ ]

(*) ( بەری ) گیرفانێکی بچوکه .

٢ ـ سوفیکسی ( ىَ î ) کە سیفەتی نیسبی دروست دەکات و بە ئەسڵ دەچێتەوە سەر سوفیکسی ئێرانی کۆن ( ئیك îk ).

هەروەکو لەمەو پێشیش وتمان هەر سوفیکسێك خاوەنی خاسیەت و تایبەتێتی خۆیەتی کە لە سوفیکسێکی تردا ئەو خاسیەت و تایبەتێتیە نیە بۆ نموونە لە زمانی کوردیدا هەندێ جار ئەم سوفیکسانە ( تی ، یەتی ، ێتی ، ئەتی ، ئایەتی ، ئایی ) دەبن بە هاومەعنا بۆ سوفیکسی ( ىَ î ) کە ناوی ئەبستراکتی دروست دەکات وەك لەم نموونانەدا دەیبینین :

برا : برایی ، برایەتی
جوانی : جوانی ، جوانێتی
درێژ : درێژی ، درێژایی
پیاو : ـ ، پیاوەتی (*)
نۆکەر : نۆکەری ، نۆکەرایەتی
هەڤال : هەڤالی ، هەڤالتی (**)
شڤان : شڤانی ، شڤانتی

بەڵام ئەم کۆمەڵە سوفیکسە نابن بە هاوەمعنا بۆ سوفیکسی ( ىَ ) کە سیفەتی نیسبی دروست دەکات ، ئەگەرچی ماملۆستا

(*) بەلای ئێمەوەوایە کە کاتێك بوە سوفیکسی ( ىَ ) چۆتە سەر وشەی ( پیاو ) یش ، بەلام بەرە بەرە وای لێ هاتوە کە لەگەڵ سوفیکسی ( ئەتی )دا بەکار بێت ئەویش لەبەر ئەوەیە کە تەلەفوز کردنی ئاسانترە .

(**) ئەم دونموونەیەمان لە دیالێکتی کرمانجی سەروەوە وەرگرتوە .

مەسعود محەمەد دەڵێت : ناوچەی کۆیە بۆ داڕشتنی سیفەی نیسبەت لە وشەی وەك « جەلی و محاقوڵی و سلێمانی » دەڵێ « جەلیەتی ، محاقوڵەتی ، سلێمانیەتی »[19] .

لەبەر ئەوەی کە ئێمە لە دیراسە کردنی سوفیکسی (تی) کە ناوی ئەبستراکتی دروست دەکات و سوفیکسی (تی) کە سیفەتی نیسبی دروست دەکات ئیعتیمادمان کردۆتە سەر ئەو مادە نوسراوانەی کە بە زمانی کوردی نوسراوە نەك بە ئیعتماد کردنە سەر شێوەی قسەکردنی ناوچەیەکی بچوك بە نیسبەت زمانی کوردییەوە ، ئەو مادە نوسراوانەی کە لەبەر دەستمانایە ئەو راستیەمان پێشان دەدات کە سوفیکسی (تی ، یەتی ، ێتی ، ەتی ، ئایەتی ، ئایتی) بە تەنها بۆ سوفیکسی (تی) کە ناوی ئەبستراکتی دروست دەکا لە هەندێ حاڵەتدا دەبن بە هاومەعنا .

ئەو وشانەی کە کۆتاییان بە حەرفی (تی ا) دەنگدار دێت ، کاتێك کە سیفەتی نیسبییان بە یارمەتی سوفیکسی (تی) لێ دروست دەکەین ، هەردوو حەرفە (تی)یە دەنگدارەکە ، واتە ئەو حەرفە (تی)یە دەنگدارەی کە دەکەوێتە کۆتایی وشەکەوە و سوفیکسی (تی) کە ئەمیش حەرفی (تی) دەنگدارە ، لەیەك دەدەن و وەك یەك حەرفی (تی) دەنگدار تەلەفوز دەکرێن .

(١٩) مەسعود محەمەد ، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد . بەرگی یەکەم ـ بەشی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل. ٥٦

بۆ نموونە دەبینین مامۆستا توفیق وەهبی کاتێك کە سیفەتی نیسبی لە وشەی ( کەراچی ) دروست کردوە ، نوسیویەتی ( کەراچیی ) واتە کەراچی + ی[20] .

ئێمەش لە وحاڵەتانەدا کە سیفەتی نیسبی لەو وشانەی کە کۆتاییان بە حەرفی (ی) دەنگدار دێت دروست دەکەین ، یان ئەوەیە سیفەتە نیسبێکە کە بە یەك (ی) بنوسین ، یان بۆ ئەوەی کە خوێنەر تێیبگات کە حەرفی (ی) سوفیکسەکە و حەرفی (ی) کۆتایی وشەکە لە راستیدا دوو حەرفی (ی)ی دەنگدارن تەنها بۆ ئەوەی باشتر تێی بگات بە دوو حەرف بینوسین ، بەڵام بە رای ئێمە تەنها بە یەك حەرف بنوسرێت باشترە ، چونکە ئەو جۆرە وشانەی کە کۆتاییان بە حەرفی (ی) دێت و بە یارمەتی سوفیکسی (ی) دەیانکەین بە سیفەتی نیسبی وەك وتمان لە کاتی قسە کردندا هەر یەك (ی)یان تەلەفوز دەکرێت وە هەروەها ژمارەی ئەو وشانەش کەمە .

جا ئێستا دێینەوە سەر راکەی مامۆستا مەسعود محەمەد ، لەبەر ئەوەی وەك وتمان دراسەکەی ئێمە لەسەر بناغەی ئەو مادە نوسراوانەیە کە بە زمانی کوردی نوسراوە وە هەروەها لەبەر ئەوەی

(٢٠) توفیق وەهبی ، دەستوری زمانی کوردی ، جزی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٢٩ ، ل. ٦٥ .

بۆ ئەم باسە بێجگە لەو سەرچاوانەی کە لە باسەکەدا پەنجەیان بۆ راکێشراوە ، کەڵك لە چەند گۆڤار و رۆژنامە و کتێبی کوردی و فارسی وەرگیراوە .

که ئیمەش له زۆر کەسی خەڵکی کۆیه یاخود ناوچەی کۆیەمان بیستوه له باتی بڵێین (سلێمانەتی) بۆ سیغەی نیسبەت دەڵێن (سلێمانی) ، واز له راکەی مامۆستا مەسعود محەمەد دێنین و بۆ ئەو کاتەی هەڵدەگرین که له دوارۆژدا هەموو سوفیکسەکانی کوردی نەك تەنها لەسەر بناغەی ئەو مادە نووسراوانەی که له زمانی کوردیدا هەمانە دیراسە بکەین ، بەڵکوو لەسەر بناغەی شێوەی قسە کردنی هەموو ناوچەکانی کوردستان .

[ رەخنه :

لێرە بە پێشەوە کە نووسەری گوتار لیستەی :

| | | |
|---|---|---|
| برا | برایی | برایەتی |
| جوان | جوانی | جوانیەتی |
| درێژ | درێژی | درێژایی |
| پیاو | — | پیاوەتی . هتاد |

هێنایەوە و بەدوا ئەودا کەوتە سەر لێکدانەوەی خۆی ، چەند تێبینیەکی زێدە گرنگ هەیە لە باریانەوە ئەگەر بە باشی تێ نەخوێندرێنەوە وەك ئەوە دەبێن کە بە چاوی نوقاوەوە سەیری دیمەن بکەین .

(١) برا برایی برایەتی .

صیغەی ( برایی ) ئەبستراکتی ( برا )یە بە گشتی و بە تجریدی

تەواوەوە وەك ( خۆشی ، چاکی ، جوانی .. هتاد )بە هۆی پاشگری ( تی ) ئەبستراکتەوە .

صیغەی ( برایەتی ) ئەو صیغەیەیە کە بە هۆی ( ایەتی ) پەیدا دەبێ و وەك لێرە بەپێشەوەش گوتومە واتای ئەبستراکت لە ( برا )وە پەیدا دەکا بۆ دەرخستنی پێوەندی نێوان کەسان . دیارە چ مانعێك نیە لەوەدا بڵێم ( برایی من و تۆ )چونکە من و تۆش بەر ئەو واتا فراوانە دەکەوین لە ( برایی )دا کە هەموان دەگرێتەوە بەڵام لە وشەی ( برایەتی )دا پێوەندییێکی تایبەتی‌تر لە هی ( برایی ) هەستی پێ‌دەکرێ کە نیسبەت و حاڵەتی نێوان دوو کەس یا دوو لایەن لە حاڵی ( تطبیق )دا رادەگەیەنێ . بە نمونەی روون کردنەوە دەڵێم کە گوترا ( نۆکەری ) لەمەدا مطلقی واتای نۆکەری بە گشتی دێتـــە بەر هەست ، بەڵام ( نۆکەرایەتی ) پێوەندی نێـوان نۆکەرێك و ئاغایێك وەیا نۆکەران و ئاغایان لە حاڵی تطبیقدا رادەگەیەنێ . وشـەی ( کەری ) کەربوون بەدەستەوە دەدات ، وشـــەی ( کەرایەتی ) بەکار هێنانی ئەحمەقی لە کارێکدا رادەگەیەنێ چ بەرهەڵستێکیش ، وەك دیواری چـەمەنتۆ ، نایەتە بەر بەکار هێنانی ( کەری ) لە شوێنی ( کەرایەتی )دا چونـکە دیارە هەردوویان ئەبستراکتی یەك وشـــەن بەڵام ئەگەر غەدر لە زمانەکە و راستی و دروستی و جوانی تەعبیر نەکەین دەبێ هـــەر یەکەیان لە شوێنی راستەقینەی خۆیدا بەکار بێنین .

برایەتی کە لە ( برا + ایەتی ) پەیدا بوە بە ناچاری یەکێك لە

(١) کاتی تێچوه چونکه بزوێن نایەته سەر بزوێن . ئەم راستیەم زۆر جار گوتوه ، هۆیشی بەدوادا دێت وەك ئەوەی که هەندێ جاران بزوێنەکه تێناچێ و دەپارێزرێ واش دەبێ کورت دەکرێتەوه .. هتاد که ئێرە جێی درێژه پێدانی نیه .

(٢) جوان جوانی جوانیەتی

(جوانی) ئەبستراکتی (جوان)ە به واتای مطلقی (جمال)

(جوانیەتی) دیاره ئەویش ئەبستراکتی (جوان)ە بەلام تخصیصیکی تێدایه واتاکەی بۆ یەکێك وەیا حاڵەتێك وەیا شتێکی تایبەتی دیار کراو دەگێڕێتەوه . کەواته (جوانی) هی گشتیه ، (جوانیەتی)ش هی تایبەتیه .

سرنج بگره له (خۆشی ، خۆشیەتی) دەبینی (خۆشی) بۆ هەمو شتێکه له هەمو حاڵێکدا ، بەڵام خۆشیەتی بەو کات و رۆژه دەڵێن که وڵات تێیدا دابین بوه و گیروگرفت نەماوه و هەرا و ناکۆکی له بەیندا هەڵستاوه . لێرەشدا وەك له (جوانی ، جوانیەتی)دا دیتمان ، گشتی و تایبەتی هاتەوه ناوەوه .

(٣) درێژ درێژی درێژایی

(درێژی) مطلقی (طول)ی هەرەبییه

(درێژایی) بەو هێنده (درێژی)یه دەڵێن که تحدید کراوه وەك درێژایی ژوورێك ، هەروەهاش (پانایی ، دەشتایی ، راستایی ،

ڕەشایی ، تیژایی ، تالآیی ...) هەمویان ئەو ئەبستراکتەن کە قبولی تحدید دەکەن وەیا بەر هەستێکی بەهێز دەکەون :

( ڕەشی ) مطلقی ( سواد )ە

( ڕەشایی زەلامەکەم دیت ) بەو هێندە ( ڕەشی )یە دەڵێن کە زەلام پێکی دێنێت لە تاریکاییدا .

( تاریکی ) مطلقی ( ظلام )ە .

( تاریکایی ) زۆرەکە ( ظلام )ی محدودی ناو ژورە .

( تاریکایی ) شەو ( ظلام )ی محدودی ئەو کاتەیە کە جوزئێکە لە چاو شەو و ڕۆژ وەیا ڕۆژگاردا .

دەڵێی ( تیژایی ) دەرمانەکەم بێن کرد . بە عادەت بێن کردن هەستێکی بێهێزە بەڵام کە دەرمان وەها کەسکۆن بـۆ بەرەو تـام کردنی ببات ڕێژەی ( ایی ) بۆ بەکار دێت ، جێی خۆشیەتی .

ئەمانە بە درێژی لە گوتارەکەی ( بەکار هێنـانی « ی » ...)ڕوَن کراونەوە خوێنەر دەتوانی لەوێدا بیانخوێنێتەوە .

( ٤ ) پیاو پیاوتی پیاوەتی

وشەی ( پیاوتی ) وشەیێکی زیندوی کوردییە و ئەبستراکتی وشەی ( پیاو )ە بە واتای ( پیاوبۆن ) وەك ( جوانی ـ جوان بۆن )ە . وا دیارە خاوەن گوتار نەی‌بیستوە گوتراب‌ێ ( پیاوتی ) . وەك ( پیاوتی ) و لە هەمان ڕێبازی دروست کردنی ئەبستراکتەوە ( ژنی ، کوڕتی ،

کچی ... ) لە وشەکانی (ژن ، کچ ، کوڕ)ەوە دێن و بەسەر زارانەوەشن ، بەڵام واتایان شتێکی زۆر جودایە لە (پیاوەتی ، ژنایەتی ، کوڕایەتی ، کچایەتی ... ) هەرچەند هەمۆشیان ئەبسترا کتن .

لێرەدا دەبێ شتێك رۆن کەینەوە کە لە بەیەکدی گرتنی نمونەکانی سەرەوە دێتە بەر چاو : بۆ گوتمان (ژنایەتی ، کچایەتی) و نەمان گوت (پیاوایەتی) ؟ گەلێك جار ئەم دیاردەیەم باس کردوە وا لێرەشدا دێتەوە پێشمان : کاتێك پاشگری (ایەتی) چوە سەر ئەو وشانەی کە لە بەرەو کۆتاییاندا دەنگی (ا) هەبێ ، یەکێك لە (ا) کان تێدەچێ لەبەر ناقۆلایی هاتنی دوَ (ا) لە یەك وشەدا کە یەکێکیان لە لاوە هاتبێ و ئەوی تریان بنجی بێ . تۆ دەڵێی (کوردایەتی ، تورکایەتی ..) بەڵام دەڵێی (ئەلمانەتی ــ نەك ئەلمانایەتی) . لە دوای لاچۆنی یەکێك لە (ا)کان ئەوەی دەمێنێتەوە لە سوفیکسەکە (یەتی)یە بەڵام لە بەکار هێنانیدا بەزۆری دەنگەکەی (ی)ش تێدەچێ هەرچەند هی وا هەیە تێی نابات و دەڵێ (ئەلمانیەتی ، پیاویەتی ، قایمقامیەتی) . من لەمەدا بیروباوەڕێکم هەیە بەڵام پێی ناوێ لێرەدا جێی پێبڕکەمەوە با بمێنێ بۆ هەلێکی‌تر .

واتای (پیاوەتی) ئەو (پیاوێ)یە تجریدییەیە لە تا کە پیاودا دەردەکەوێت واتە لە رەفتاردا بەکاری دێنێت .

(٥) نۆکەر نۆکەری نۆکەرایەتی

ئەمیش وەك برایەتی و پیاوەتی وایە : کردنی نۆکەرایەتی لە

لایەن یەکێکەوە وەیا پێوەندی (ئاغا و نۆکەری) نێوان دوکەس دیار دەخات .

پێی ناوی خۆم زۆر بەوە خەریك کەم کە بسەپێنم بەکار هێنانی (نۆکەری) لە جێی (نۆکەرایەتی) شتێکی سەیر نیە چونکە هەردوکیان لەبستراکتی یەك وشەن .

ئەوجا با بێینە سەر حیسابی ئەوەی کە من لە گوتاری (بەکار هێنانی «ی» ..)دا گوتبوم لە بارەی بەکار هێنانی ڕێژەی (جەلیەتی ، محافۆلیەتی) بۆ نیسبەت کە لێرەدا خاوەن گوتار لێی کردوم بە رەخنە .

من لەو راپۆری بۆ ئەنجومەنی کۆڕم نوسیبو گوتبوم وەرای ئەم رەخنەیە ناخەمە ناو راپۆرەکەوە چونکە بە نامە بۆ خاوەن گوتارم ناردبو ، لەوەشدا رەچاوی هێندێم کردبو کە چاوەڕوان دەکرا رەخنەکان سەرلەبەریان بۆ خاوەن گوتار بچنەوە چونکە ئەوسا دوا نامەی خاوەن گوتار تێمانی نەگەیاندبو پێویست بە ناردنی رەخنەکان ناکات بۆی . ئێستا وا باری کارەکە گۆڕا چونکی ئەو وەرامانەی من بە نامە ناردومن بۆ خاوەن گوتار کەوتنە نهێنیەوە ئیتر دەبێ لێرەدا رایەکی هەمبێ بێخەمە سەر کاغەز نەك بە نیازی لەسەرخۆکردنەوە ، بەڵکو لەوە زیاتر بۆ مەبەسی دەربڕینی ئەوەی بە ڕاستی دەزانم لەم باسە ڕێزمانیەدا .

من کە دەڵێم «ی» نیسبەت بەدوا ئەو وشانەی کۆتاییان

بە (ی) دێت دەپارێزرێت شتێکی راستم گوتوە و بە گوێی خۆم بیستومە و بۆ خۆشم بەکارم هێناوە . شایەدی کۆیی یەك لە مۆسکۆ قسەی من رەت ناکاتەوە چونکە ئەویش وەك من تاکە ، بەڵام تاکێکی بێ باك لەماست رێزماندا .. بێ پێوەندی لەگەڵ زوربەی خەلقی ناوەوە و دەرەوەی کۆییدا .. بێ توژینەوە لە رایەڵ و تەونی ناوەکی زمانی کوردیدا . ئەم گوتەیەی ( نەمبیستوە ) گەلێك پەرەسەندوە لە نێوان خوێنەرانی کوردا چونکە زوربەیان بۆیان رێك نەکەوتوە بە ئاپۆرەی کوردەواری بگەن و لێیان ببیەن ، کە بە زمانیشەوە خەریك نەبن دیارە گەلێك شت هەیە لە زماندا بەسەریدا ناکەون . نوسەری گوتار بۆ خۆی وا دەزانێ لە زمانی کوردیدا دەستوری گشتی بۆ ناوی ئەبستراکتی وشەی وەك « برسی ، سپی » ئەوەیە بکرێتە ( برسێتی ، سپێتی ) کەچی ئەمە بەکارهێنانێکی ناوچەی سلێمانییە خەلقی تر بە پێی دەستوری رەسەنی شکاندنەوەی ( ی ـ کە نوسەران بە دوو « ی » دەنوسن ) وشەکان دەکەنە ( برسیەتی ، سپیەتی ـ من وای دەنوسم : لە راستیشدا کسرەیێك بە دوا دەنگی « س ، پ »دا دێت ئەو جا « ی » کۆنسنانت ، کە ئەگەر ، بە وردی ، دەستوری رێنوسی کوردی لێ بەکار بێنین دەبێ بنوسین « برسییەتی ، سپییەتی » ) هەروەك شکاندنەوەی ( وَ ) لە کۆتایی وشەدا دەیکا بە ( ضمە ) یێك و ( و )ێکی کۆنسنانت ... دیارە نوسەری گوتار بۆی رێك نەکەوتوە لەم تەمەنەی خوێندنیدا گەشتی

گوێی‌بیست بوونی ئاخاوتنی کوردیی بە ناو دەشت و دەری دوور و نزیکی کوردستاندا بکات بۆیەیە وا بەراشکاویی زاری سلێمانی لێ‌بوە بە زمانی سەرلەبەری کورد . کە بۆی رێك نەکەوتوە گەشـت بکا بۆی رێك کەوتوە نووسراوان بخوێنێتەوە ، دیارە نووسراوی کوردیی بە زۆریی لە لایەن نووسەرانی خەڵقی سلێمانیەوە بڵاو دەکرێنەوە ئەوانیش هـەر دەنووسن ( بڕسێتی ... ) بەمەشـــدا هێندەی‌تر ئەم قاڵبـە ناوچەیی‌یە نەفیی‌بەستووتر دەبێت لەچاو و مێشکی خوێنەرەوەدا .

تێ‌نەچوونی « تی » نیســـبەت لە ئاخاوتندا ، جگـە لەم قاڵبەی « جەلیەتی ، مماقوڵیەتی » جارێـکی‌تریش بەرچاوتر دەبـێ بەوەدا کە هات و کەوتە پاش وشەی وەك « بەغدا ، هێرو ، تەنجە »وە دەنـگێکی « ی » کـۆنسنانت دێتە نێوانەوە بۆ ئەوە بتوانرێ « تی »کەی نیسبەت هەر بە بزوێنی بێنێتەوە . تۆ دەڵێـی « بەغدا + ی + تی = بەغدایی ـ هێرو + ی + تی = هێرۆیی ... » هەرگیز ناڵێـی « بەغدای ، هێرۆی » کەچی ئەگەر لەجیاتی « تی » نیسبەت « ی » کەسی سێیەمی تاك وەیا هی‌ئیزافە وەیا هی وصف وەیا « یت »ی قسەبۆکراو بێت چ دەنگێکی نێوەندیی نایەت تاکـو بە بزوێنی بێننەوە ، بە نموونە :

مەل خواردی

تۆ رۆیشتیت

ئێمە دەچین

لەمانەدا دەنـگی « ی » راناوەکان بزوێنە ، بەڵام :

مەل هێنای

تۆ دەکەیت

ئێمە دەنوین

دەنگەکەی «ی» تێیاندا بۆ بە Consonant .

هەروەهاش لە حاڵی اضافه و وصفدا :

بەردی رەق (وصف)

ماستی هەولێر (اضافه)

دیارە «ی»کان بزوێنن ، بەڵام :

چیای بەرز (وصف)

درۆی ئەلفلەیلە (اضافه)

لەمانەدا «ی»کان بۆن بە Consonant

لەم نمایشتە بۆت روون دەبێتەوە لە کوردیدا «ی» نیسبەت گەلێک بەحورمەتترە لە «ی»یەکی‌تر کە لە ئاخاوتندا دێتە ناوەوە . بەڕاستی ئەم «ی»ە نیسبەت هێندەی هی ئەبستراکت بنجی و گرینگە لە لایەن تێ‌خوێندنەوە و پاراستنەوە ، جا ئەگەر دیتت لەو وشانەدا کە کۆتاییان «ی» بزوێنە رێژەیێك بەکار دێت دەست بدا بۆ پاراستنی بزوێنی «ی» نیسبەت ، نابێ ئەم کارەت بەلاوە سەیر بێ و خێرا لەبەر سێبەری بەکار هێنانی ناوچەییدا دەستورەکە کوێر کەیتەوە . خەڵق دەڵێن (جەلیەتی ، معاقوڵیەتی ..) چ مەبەستیشیان ئەوە نیە رێژەیێکی ئەبستراکتیان بەکار هێنابێ ، بە رێکەوت هەردوو رێژە لەم

شوێنەدا یەك دەگرنەوە .

ئەمەت لە بیر بێ .

سەیر لە شتێکدایە کە هەر بەجارێ سنوران دەبەزێنێ لە نێوان ڕێژەی نیسبەت و ڕێژەی ئەبستراکت ئەگەر بێین و بڵێین وەك یەك بوونی دوو ڕێژە دەیانکات بە یەك شت : لە سەرانسەری کوردستانی خوارووادا ئەم ناوانە بەکار دێن :

( باڵەکێتی ـ وەیا باڵەکایەتی ـ ، خۆشناوەتی ، دزەییاتی ، بڵباسەتی ، جافەتی ، مەنگوڕایەتی ، شینکایەتی ، گەردییاتی ، ئاکۆییانی ، مامەشەتی ... ) . دیارە ڕێژەی ناوەکان هی ئەبستراکتن کەچی مەبەستیش لێیان نیسبەتە چونکە کە دەڵێی ( لە وڵاتی مەنگوڕایەتی ... ) مەبەست ئەو وڵاتەیە کە مەنسوبە بە مەنگوڕ نەك لە وڵاتی (واتای مەنگوڕ) . کە دەشڵێی لە (خۆشناوەتیدا ژن هەڵگرتن نیە ) ئاشکرایە دەتەوێ بڵێی (لەو وڵانەی مەنسوب بە خۆشناو ـ نەك مطلقی واتای « خۆشناو » کە هەرگیز نابێتە زەرفی ڕوودان وەیا ڕوونەدانی ژن هەڵگرتن ) . ئەمە شتێك نیە نەسەلماندن هەڵبگرێ وەك گوتەی (جەلیەتی ، عاقوڵیەتی . .) کە ئەویش ، بەڕاستی ، نابێ گومانی لێ بکرێ چونکی من لەوانە نیم لەخۆوە شتی وەها زەق هەڵبەستم . بە هەمە حاڵ مەنگوڕایەتی و هەڤاڵەکانی ڕێژەی ئەبستراکتن کەچی بۆ نیسبەتیش بەکار دێن .

دەبێ بزانین لە کوردیدا گەلێك ڕێژە (صیغە)ی نیسبەت هەیە

نەك هەر ئەو تاکە ریژەیەی کە بە هۆی (ی) پەیدا دەبێت وەك کە بڵێی ( ناوەکی ، دەرەکی ، سەرزارەکی ، راستۆکی ، خوارۆکی ، رەشۆکی ...هتاد ) . لە بەرانبەر وشەی وەك : ( رجالی ، نسائی ، ولادي ، بناتی ) دەگوترێ ( پیاوانە ، ژنانە ، کوڕانە ، کچانە .. ) . کە بگەڕێینەوە بۆ زمانێکی وەك ئینگلیزی لەوێدا (ی) نیسبەت هەر بە جارێ ونە مەگەر ناوناوەیێکی وەك ( Iraqi ) کە بڕوا دەکەم لە ( عیراقی )یەوە هاتوە .

جگە لەم تێبینیانە دەبێ ئەوەش دەرنەزەر بکەین کە کورد بە هۆی ئاشنابوونیەوە بە ئاخاوتن و ڕێزمانی عەرەبی لێیی چاوەڕوان دەکرێ ، لێرە و لەوێ ، شوێن پێی ئەوان هەڵگرێتەوە وەك ئەوەی کە ناوێك لە بنەڕەتدا (ی) نیسبەتی پێوە بێ کوردیش بە چاولێکەری عەرەب لە حالی نیسبەتدا وەهای بەبڵێتەوە بە نمونە ، ناوەکانی ( سلێمانی ، ئامێدی ، جەباری ، میراودەلی .. ) خۆیان نیسبەت دراون بۆ ( سلێمان ، عماد الدین ، جەبار ، میراودەل ) . لەم حاڵەدا دوور نیە ، عەیبیش نیە ، نیسبەت بۆ ئەم ناوانە هەر ناوەکان خۆیان بن بێ گۆڕینی ڕێژەیان هەرچەند چ مانعێکیش نیە ڕێژەی دەستوری بۆ ئەوانیش بەکار بێت . لەمە بترازێ ناشێ تۆ بە یەکێك بڵێی ( جەنابت کەراچی‌یت ) چونکە هەروەك بەر دەستور ناکەوێ راستەوخۆش واتای رستەکە دەبێتە ( جەنابت شاری کەراچی‌یت ) . گومان مەکە لەوەدا کە ئەگەر کوردێك بیستی یەکێك بە یەکێکی تر دەڵێ ( جورج نابۆلییە )

بیری بۆ ئەوە بڕوا کە وشەی (ناپۆلی) واتایێکی وەك پسپۆڕ وەیا مامۆستای هەبێ ئیتر بچێتە دڵیەوە کەوا (جورج دکتۆر نیە چونکە دەرکەوت ناپۆلییە). کورد کە هەر چاری نەما بۆ دەربڕینی نیسبەتی مرۆڤ بە شوێنێك وەیا شتێکەوە دەڵێ (خەلقی کەراچیم وەیا سلێمانیم)، هەرگیز نەچێتە دڵتەو کورد بڵێ (من کەراچیم) بشزانێ کەراچی ناوی شارێکە.

سەیرێکیتریش لەم موعەمایەی (نیسبەتی کوردی)دا ئەوەیە کە ئەگەر (ی) نیسبەتت خستە سەر ناوی گەل وەیا هۆز ئەوەی پەیدا دەبێ نابێتە (مرۆڤ) بەڵکو دەبێتە زمان وەیا عادەت وەیا پۆشاك.. ئەمەش بە پێچەوانەی زوربەی زمانانیتر: (کوردی) مرۆڤی کوردنیە، (بلباسی)ش کابرای بلباس نیە بەڵکو یەکەمیان زمانی کوردییە دوەمیشیان نەریت وەیا پۆشاکی بلباسە. کەگوتت (Kurdish) بۆ زمان و مرۆڤ وەك یەکە، هەروەهاش لە عەرەبیدا (کردی) بۆ پیاوی کورد و (لسان الکرد)ە.

ئەم مەیدانەی ڕێژەی نیسبەت و ئیسمی مەعنا گەلێك لایەن و ڕێبازی کورت و مام ناوەنجی لێ دەبێتەوە کە من ڕێم نیە لێرە بە هەموانیدا بێم و بچم، لە نوسەری گوتاریش داوا ناکەم هەموویانی پێچابێتەوە چونکە دەزانم لە چ سەرچاوەیێکی نوسراوی کوردیدا قوڵ بونەوە بۆ بنی ئەو لاباسانە وەیا پان بونەوە بۆ هەمو ئاسۆکانیان بە دەست ناکەوێ، سەرنج ڕاگرتنی خۆشی هێندەی درێژە نەکێشاوە گەیاندبێتی بەوبەڕی

باسەکان ، بەلام لێی داوادەکەم سەیری بێتەوە لە زۆر بۆنی ئەمراز وەیا پاشگری ناوی ئەبستراکت لە کوردیدا و پرسیارانیش لە خۆی بکا ئایا لە چیدا ئەمانە واتایان لە یەکتر دەترازێ ! با سەیری بێتەوە و پرسیارانیش بکا هەرچەند هیچ وەرامێکیش وەرنەگرێتەوە چونکە بێ دەنگ بوون لە جاست دیەنی نامەفهوم وەك ئەم زۆر بۆنەی سوفیکسی ناوی ئەبستراکت هەر بەجارێ نرخی دیەنەکە تێدەبات وەك ئەوەی چ راگەیاندنێکی وشەسازی نەبێت کەچی بۆ خەلکی لە نۆسینی یەکێکی وەکو مندا ( بەکار هێنانی « ی » ... ) شتێکی لە سەر ئەم لایەنە خوێندۆتەوە ئەگەر کەم و کورتیش بێ هەوڵی داوە تیشکێك باوێژێتە سەر دیاردەکە ، جاکە ئەم شوێن پێیە لە چزگەی باسەکەدا هەبێ ، دەبێ هەنگاوی تر زۆتر و ئاسانتر بەرەوپێشەوە بڕوات .

[ نرخێنەر ]

یەکێکی تر لەو خاسیەتە تایبەتیانەی کە لە سوفیکسی ( ی ۱ ) ی ناوی ئەبستراکتی و سوفیکسی ( ی ۱ )ی سیفەتی نیسبیدا هەیە ئەوەیە کە زۆر جار لە حاڵەتی سیفەتی نیسبیدا کە بە یارمەتی سوفیکسی ( ی ) پێك هێنراوە ، سوفیکسی ( ی ) فرێ دەدرێت بەبێ ئەوەی کار بکاتە سەر مەعنای رستەکە بۆ نمونە :

۱ ــ قاوەی بەرازیلی باشترین قاوەیە .

۲ ــ قاوەی بەرازیل باشترین قاوەیە .

لە رستەی یەکەمدا وشەی ( بەرازیلی ) سیفەتی نیسبییە و وەك

ئاشکرانه به یارمەتی سوفیکسی (تی) پێك هاتوه، له رستەی دوەمدا سوفیکسی (تی) له وشەی (بەرازیلتی)دا فزلی دراوە کەچی مەعنای رستەکە هەروەك مەعنای رستەی یەکەم ماوەتەوە .

ئەم فزلی دانەش له ئەنجامی بەرەوپێش چونی زمانە، کە هەمیشه ئادەمـــیزاد له کاتی قسە کردندا هەوڵ دەدات مەبەستی خـــۆی به کورترین شێوە دەر ببڕێت . بەڵام به نیسبەت سوفیکسی (تی)ی ناوی ئەبستراکتیبەوە به هیچ جۆرێك ناتوانرێت له رستەدا فـــزلی بدرێت ، چونکە ئەگەر هاتو فزلی درا به یەك جار مەعنای رستەکە دەگۆڕێت . بۆنمونە :

١ ـ گۆران له ئەدەبی کوردیدا به شاعـــیری جوانتی و سروشت دەژمێرێت .

٢ ـ گۆران له ئەدەبی کوردیدا به شاعیری جـــوان و سروشت دەژمێرێت .

دەبینین پاش فزلی دانی سوفیکسی (تی) له وشەی (جوانتی)دا وەك له رستەی دوەمدا دیارە مەعنای رستەی دوەم نەك تەنها گۆڕا بەڵکو هەرکەسێك گوێشی لێبێت تێی ناگات مەبەست لەم رستەیە به تەواوتی چییە ؟

کەواتە دیسانەوە بۆمان دەردەکەوێ کە دوو سوفیکسی جیاوازن وهەریەکێکیان خاسیەتی تایبەتی خۆی هەیە کە لەوی تریاندا نییە .

دەمانەوێت سەرنجی خوێنەرانی بەڕێز بۆ ئەوە رابکێشـین کە

هەندێ وشە هەیە ئەگەر بێتو بە تەنها تەماشای بکەین و نەیخەینە ناو رستەوە ، ناتوانین بزانین کە ئایا ئەو وشەیە ناوی ئەبستراکتییە یاخود سیفەتی نیسبییە ؟ بۆ نمونە : وشەی ( بازرگانی ) ئەگەر بە بێ رستە تەماشای بکەین دەبینین کە ناوی ئەبستراکتییە و لە هەمان کاتیشدا سیفەتی نیسبییە . لەم حاڵەتانەدا باشتر وایە لە رستەدا تەماشای ئەو جۆرە وشانە بکەین ، چونکە لە رستەدا بە تەواوی بۆمان دەردەکەوێت کە ئایا ئەو وشەیە ناوی ئەبستراکتییە یاخود سیفەتی نیسبییە ؟ وەك لەم دوو رستەیەدا بۆمان دەردەکەوێت کە وشەی ( بازرگانی ) لە رستەی یەکەمدا ناوی ئەبستراکتییە ، بەڵام لە رستەی دووەمدا سیفەتی نیسبییە :

١ـ زۆر کەس لە دانیشتوانی عێراق بازرگانی دەکەن .

٢ـ دهۆك پاشەرۆژێکی روناکی هەیە ، چونکە دەبێتە ناوچەیەکی بازرگانی و زانستی وپیشەسازی لە بەهدینانا .

[ رەخنە :

لە بارەی ( قاوەی بەرازیلی و قاوەی بەرازیل )ەوە .

نوسەر وای بۆچوە ( قاوەی بەرازیل ) کورت کرایەوەی ( قاوەی بەرازیلی ) بێت .

ئەم بۆچونە هەڵەیێکی ساکارە :

قاوەی بەرازیلی : تەرکیبێکی وصفییە بە هوی ( ی ) نیسبەتەوە پێك هاتوە . قاوەی بەرازیل : تەرکیبێکی ( اضافی )یە وەك ( داری

کەژ ، ماسی هـــەولێر ، بەفری قەندیل ... ) و چ پێوەندی بە وصفەوە نیە تـا بڵێین لەو کورت کراوەتەوە .

ئەم هەڵەیە لەوەندەدا ناوەستێ ، ئاکامی‌تریشی هەیە .

کە گوتت ( ڤاوەی بەرازیلی زۆر باشـە ) مەبەست ئەوەیە ئـەو ڤاوەیەی کە پێی دەڵێین ( بەرازیلی ) زۆر باشە واتە نەوعەکەی باشە با لە شوێنێکی‌تریش چاندرابێ وەك کە بڵێی ( رەســەنە ولاغی عەرەبی باشە ) با لە چینێش زاوزێی بکات . بەڵێ دەزانین ( ڤاوەی بەرازیلی و ولاغی عەرەبی ) بە ئەسڵ لە بەرازیل و عەرەبستان پەیدا بوون بەلام هەرگیز ئەوە ناگەیەنێ کە دەبێ ماڵی بەرازیـل و عـەرەب وەیاخود عەرەبستان بن . ڤاوەی بەرازیلی رەنگە بە رێکەوت لە بەرازیلەوە هاتبێ وەیا لەشوێنێکی‌ترەوە . ( توتنی کوردی ) شتێکە و ( توتنی کورد ) شتێکی‌ترە ، رەنگە توتنی کورد لە نەوعی ڤەرجینیاش بێت هی یۆنانیش لە توتنی ( کوردی ) یەوە کەوتبێتەوە .

ئەم فەرق نەکردنەی نوسەر لە نێوان ترکیبی اضافی و وصفی‌دا وای کردوە لە لێکدانەوەی دواتریشـی زۆر لە راسـتی دورکەوێتەوە بەوەدا کە هاتوە دوو ترکیبی جوداوازی لە یەکتر نەچووی بە یەکتر گرتوون کە لە هیچ روویێکەوە ناگەنەوە یەکتر : لە دوو نمونەی ( شاعیری جوانی و سروشت ) و ( شـاعیری جوان و سروشت )وای زانیوە گۆڕانی واتای رستەکان دەگەڕێتەوە بۆ گرنگی ئەو دەورەی کە ( ی ) ئەبستراکت دەی‌بینێ . بەلای ئەوەوە پێشــتر کە ( ڤاوەی

بەرازبلی ) کرایه ( قاوەی بەرازیل ) واتاکەی نەگۆڕا بۆیەبۆ چونکە (ی) نیسبی ئەو گرنگه نیه وەك (ی) ئەبستراکت کە بە لادانی واتا بگۆڕێ . ئێمه زانیان و دەزانین (قاوەی بەرازیلی) زۆر جودایه له (قاوەی بەرازیل) ، بابی ئەوەی کە (شـــاعیری جوانی) جودایه له (شاعیری جوان) .

نوسەر ، چونکە له نمونەی ( بەرازیل و بەرازیلی )دا به سەهو چوبو رێی به خۆی دا سەرلەنوێ به سەهو بچێتـەوه و وصف و اضافه به یەکدی بکرێ چونکە دیاره ( شاعیری جوانی ـ وەك قاوەی بەرازیل ) اضافەیه ( شاعیری جوان ـ وەك قاوەی بەرازیلی ) وصفه .

داوا دەکەم له نوسەر پتر لەم باسانه ورد بێتەوه تاکو به ئاسانی نەکوێتە باری نازێکی وەك ئەمەی هەر ئێستا بۆی روَن دەبێتەوه :

ئەگەر لادانی (ی) نیســبەت وا بێبایەخ بێـت وەك ئـــەو رایَنواندوه دەبێ لەم نمونەیه و هەزارانی وەك ئەویش بێبایەخیەکەی بەدی بکرێت ، نمونەکەش ئەمەیه :

کارگێڕی فابریقەی سەرچنار ( رەواندزی )یه .

کارگێڕی فابریقەی سەرچنار رەواندزه .

بێ گومان رەواندز کارگێڕ بێ گەلێك ناقۆلاتره لەوەی گۆران شاعیری جوان بێ .

من له سـەرنج راگرتنی تایبەتی خۆمدا گەیشتومەته ئەو باوەڕه کە جوتە (ی) ناوی ئەبستراکت و ئەداتی نیسبەت تێناچن ، چونکە

تێچوونیان رستە هەڵدەتەکێنێ و واتای دەگۆڕێت ، وەك ئەوە نیە (ی) کەسی سێیەم و دووەم وەیا هی ئیزافە و وەصف تێدەچن و واتاش پارێزراوە . من لە نوســـینمدا روونم کردۆتەوە ، وەك لەم جارەشدا دووبارەم کردەوە ، ئەم جۆرە (ی)یە نەك تێناچن و بەس ، بەڵکو هێند گرنگن هەمیشە بە بزوێنیش دەمێننەوە .

بە ورد بوونەوە چەندین شتی‌تریش روون دەبێتەوە کە هەندێکیان لەم گوتارەدا بە لێلی باس کراون ، یەکێك لەمانە لەیەکچوونی رێژەی نسبی و رێژەی ئەبستراکتە لە هەندێ وشەدا وەك کە بڵێی (بازرگانی بە واتای تجارەت ، بازرگانی بە واتای تجاری) . نووسەری گوتــار نەختێك بە سەرسامییەوە تەماشای دیەنەکە دەکات کەچی زۆر ئاشکرایە لەیەك چوونی ئەبستراکت و نسبی لە وشەی (صفە وەیا وصفی)دا پەیدا دەبێ چونــکی ئەبستراکتی صفە (وەیا وشەی وصفی) بە هۆی (ی) دەبێ کە نیسبەتیش هەر بە هۆی ئەوەوە دەبێت و لەمەدا بەرواڵەت یەك دەگرنەوە . بەڵام وشەی‌تر کە بە هۆی (ایی) وەیا (ەتی) وەیا (ایەتی) دەبێتە ئەبستراکت لە خەیاڵیشدا گومانی لێ ناکرێ بــۆ نیســـبەت بێت . کە گوتت (کوردایەتی) هەرگیز خەیاڵت بۆ ئەوە ناڕوات کە مەبەست (کوردێتی) بێت هەروەها (پیاوەتی ، ســپیەتی ، بڵندایی ...) . با ئەوەش لێرەدا بڵێیم ئێمە کە دەڵێین نیسبەتی وشــەی وەك (سور ، زەرد ، خۆش ...) دەبێتە (خۆشی ، سوری ، زەردی) ئەمە هەر گوتەیێــکی رێزمانییە ، واتە بە دەستووری رێزمانــ دەبێ

وشەکان لە نیسبەتدا وایان لێ بەسەر بێت ئەگینا کورد لێرە بە پێشەوە بیری بۆ ئەوە نەڕۆیشتوە لە وشەی (زەرد بەواتای أصفر) نیسبەت دروست کات و بڵێ (زەردی بەواتای أصفریّ) . هەروەك ئینگلیز بۆ نیسبەت تاکە صیغەیێکی نیە کوردیش هـــەر جارە بە جۆرێك نیسبەتی لە وشەی وەهادا دروست کردوە کە بە سەلیقە (ی) تحمل ناکات . کەس نەی‌گوتوە (زەردی) مەگـەر زەرد ناوی ئاوایی وەیا عەشرەت وەیا شتێـکی ئەوتۆیی بێت کە کورد نیسبەتی وەپاڵ ناوە . تۆ سەیری کورد دەڵێ (ڕەشتاڵە ، سوورکاڵ ، زەردباو ، سپـی پات ، سەوزە ...) نە هاتوە یەك صیغە بۆ هەموان دانێت . بەلای منـەوە نیسبەت دان وەپاڵ وشەی وصفی بێ‌هێزی وەك (خـۆش ، زەرد ، جوان) نابێ بە هۆی (ی)وە بێت چونکە کورد ئەمـەی نەکردوە ، سەلیقەی کوردیش بۆ ئەمە ناڕوات . بە ڕاستی (ی) نیســبەت کە خرایە دوای جوان و کرایە (جوانی بەواتای جمالی) وەك ئەوەیە قاعیدە ناقۆڵاکەی عەرەبی بە سەر فیعلی (وَجِلَ)دا بێنیت و لە صیغـەی ئەمردا بڵێیت (یازیدوجَـل) کـە گویا ئەصلەکەی (یازیدُ إوْجَـل) بوە و بە پێی دەستورێـکی دور و درێژ و تێـکەڵ پێـکەڵ وای لێ بەسەر هاتوە کە من دەڵێم شتی وەها ڕێزمان نیە و تەشقەڵەیە . لەکوردیشدا ڕێژەی (زەردی) هەرگیز (أصفری) نیە . ئێمە کە هەر بێین و بە پێـی پێشکەوتنی تعبیر ڕێژەی لەبار بەکار بێنین بۆ چـی ریشی خۆمان بدەینە دەست دەستورێـکی دوَرە دەست کە وەك دزێك لە چاو بچەقێ ؟

بۆ نەیەین ڕێژەیێـکی‌تری نیسبی زۆر لەکارهاتو و باوی کوردیی لـەم شوێنانەدا بەکار بهێنـین ؟ دەزانین کورد دەڵێ ( یەکجارەکی ، دوایەکی ، لاوەکی ، دەرەکی ، پێشەکی ، ئـاوەکی ، ســێ جرتـەکی ... ) کە هەمویان وشەی نیسبین ، نەی‌گوت ( دوایی ، لاوی ، دەری ، پێشی ، ئاوی ، سێ جرتی .. ) کەواتە بۆ چی پەیڕەوی ئەم دەستورە نەکەین لە داڕشتنی صیغەی نیسبی لە وشەی بێهێزی وەصفی ؟ بۆ چی نەڵێین ( زەردەکی ، سپیەکی ، خۆشەکی ، جوانەکی ... هتاد ) کە صیغەیێـکی کوردیی و بەسەر زارانەوەیە و لە سەرشێواوی ئەوەشت ڕزگار دەکات کە تێـکەڵ بە واتای ئەبستراکت ببێت ؟ بۆ نەڵێین ( جوانی ـ جمال ، جوانەکی ـ جمالی ) ؟ . ئەو لیژنەیەی منی تێدا ئەندامم و خەریکی دانانی زاراوەی زانستەکانە ئەم دەستورەی پەسند کردوە و زۆریش تێیدا حەسایەوەیە ، پێشتریش ناوناوەیێك ئەنجومەنی کۆڕ لە دانانی هەندێك زاراوەدا ئەم ڕێژەیەی بەکار هێناوە . یەکێك لە هۆی پاڵپشتی کردن لەم ڕێژەیە ئەوەیە کە دەنگی ( ك ) لە کوردیدا ڕۆڵێـکی وصفی دەبینێ چ لە فیعل و چ لە ناودا ... من داوا دەکەم نوسەری گوتار کە بۆی ڕێك کەوتوە خەریکی زمان بێت نیگای خۆی بۆ ئەم لایەنانە باوێژێت و لێیان وردبێتەوە و ، ئەگەر بۆی لوا ، بیانباتەوە سەر بنجی مێژوویی خۆیان وەك کـە جۆتە ( ی ) نیسبەت و ئەبستراکتی بۆ ڕوون کردینەوە .

[ نرخێنەر ]

ئیستا دێینه سەر باسی چۆنێتی دروست کردنی ناوی ئەبستراکتی بە یارمەتی سوفیکسی (ی ێ)و هەروەها سیفەتی نیسبی بە یارمەتی سوفیکسی (ی ێ) ، بەڵام لەبەر ئەوەی کە سوفیکسی (ی)ی ناوی ئەبستراکتی زۆر بەرهەمدارترە و رۆڵێکی یەجگار گەورەتر لە مەیدانی وشەسازیدا وەك لە سوفیکسی (ی)ی سیفەتی نیسبی ، لە سەرەتاوە باسی چۆنێتی دروست کردنی ناوی ئەبستراکتی لە زمانی کوردیدا دەکەین کە بە یارمەتی سوفیکسی (ی ێ) کە ئەسڵەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سوفیکسی ئیرانی کۆن (ئیه īh) دەکەین .

## چۆنێتی دروست کردنی ناوی ئەبستراکتی لە زمانی کوردیدا بە یارمەتی سوفیکسی (ی ێ)

لە زمانی کوردیدا سوفیکسی (ی ێ) رۆڵێکی یەجگار باڵا لە دروست کردنی ناوی ئەبستراکتیدا دەبینێت . ئەم سوفیکسە دەتوانین بە بەرهەمدارترین سوفیکسی لە زمانی کوردیدا دابنێین ، چونکە هەتا ئێستا ئەم سوفیکسە ژمارەیەکی یەجگار زۆری لە ناوی ئەبستراکتی لە زمانی کوردیدا دروست کردوە . ئەو ناوە ئەبستراکتیانەی کە بە یارمەتی ئەم سوفیکسە دروست کراون ، بە شێوەیەکی گشتی یا حاڵەتێك ، یا خاسیەتێك ، یا جۆری (نەوعیەتی) شتێك ، یا جۆری ئیشێك ، یان نیشانەی شتێك پێشان دەدەن . ئەو ناوە ئەبستراکتیانەی کە لە زمانی کوردیدا بە یارمەتی ئەم سوفیکسە

دروست کراون ، وەك هەمو ناوێـکی ئەبستراکتی کە لە زمانەکانی تری جیهـاندا هەیە ، بە شێوەکیە گشتی نەدەتوانرێ ئەو شتەی کە ئەم دەلالەتی لێ ئەدات ببینرێت وەیاخود بۆنی بکرێت یاخود دەســـتی لێبدرێت بۆ نمونە :

کاتێك کە دەڵێین ( باخەوانی ) ئێمە ( باخەوانـ ) دەبینین و دەتوانین دەستی لێ بدەین نەك ( باخەوانی ) .

سوفیکسی ( ی î ) لە وشەی ئاسان و بارگران ناوی ئەبستراکتی دروست دەکات . هەروەها چۆن چۆتە سەر ئەو وشانەی کە ئەسلیان کوردین ، هەر بەو جەشنەش چۆتە سـەر ئەو وشانەی کە ئەسلیان کوردی نین ، واتە ئەو وشانەی کە لە زمانی ( عەرەبی ، فارسی ، تورکی ... هتد )ەوە هاتونەتە زمانی کوردییەوە .

ئەگەر هاتو وشەیەك کۆتایی بە حەرفی دەنگدار هات ، ئەوا حەرفی ( ی y ) بێدەنگ دەچێتـە نێوان ئەو حەرفە دەنگدارە و سوفیکسی ( ی î ) یەوە وەك :

| وشە | ناوی ئەبستراکتی |
|---|---|
| برا | برایی |
| تۆڕە | تۆڕەیی |

ئەو وشـانەی کە کۆتاییان بە حەرفی ( ی ) دەنگدار دێت ، بە یارمەتی سوفیکسی ( ی î ) ناتوانرێت ناوی ئەبستراکتیان لێ

دروست بکرێت ، بەڵکو بە یارمەتی سوفیکسی ( تی ti ) کە یەکێکە لە سوفیکسە هاومەعناکانی سوفیکسی ( ی i ) ناوی ئەبستراکتیان لێ دروست دەکرێت . پاش ئەوەی کە سوفیکسی ( تی ti ) دەچێتە سەر ئەو وشـــانەی کە کۆتاییان بە حەرفی ( ی ) دەنگدار دێت ، ئەو حەرفی ( ی ) دەنگدارە دەگۆڕێت بە حـەرفی دەنگداری ( ێ ê ) وەك لەم نمونانەدا بۆمان دەردەکەوێت .

| وشـــه | سوفیکسی ( تی ti ) | ناوی ئەبستراکتی |
|---|---|---|
| قوتابی | تی | قـوتابێتی |
| خوێڕی | « | خۆێڕێتی |
| سەرسەری | « | سەرسەرێتی |
| ڕۆژنامەچی | « | ڕۆژنامەچێتی |

[ رەخنە :

نوسەر لە سەرەتای ئەم لاباسە (چونێتی دروست کردنی ناوی ئەبستراکتی .. )دا باسی رۆڵی ( ی ) ئەبستراکت دەکات بێ ئـەوەی هۆی زۆرچەشنی واتا دروست کراوەکان باس بکات وەیا بۆی بچێ ، وا دیارە لە بنەڕەتەوە هەستی پێنەکردوە . نۆسەر دەڵێ ( ئەو نـاوە ئەبستراکتیانەی کە بە یارمەتی ئەم سوفیکسە دروســت کراون ، بـە شێوەیێکی گشتی یا حاڵەتێك ، یا خاسیەتێك ، یا جـۆری ئیشێك ، یان نیشانەی شتێك پێشان دەدەن ) . لێرەدا نوسەر وایزانیوە هەر سوفیکسەکە خۆی ئەم هەمو واتا جودایانە دروسـت دەکات ، کەچی

راستی کارەکە ئەوەیە سوفیکسی (ێ) لەوە بەولاوە کە وشەی مادی بگێڕێ بە ئەبستراکت چی‌تری لە دەست نایەت . سوفیکسەکە لە لاوە واتای زیاد ناهێنێ بۆ ناو وشە ، واتای ناو وشە لە مادییەوە دەکا بە ئەبستراکت ئیتر واتاکە چی هەیە ئەوەیە لە ناو وشەکەدایە و هیچی لە دەرەوە بۆ نەخوازراوەتەوە . کە وشەی (رەش) دەکاتە (رەشی) هەر ئەوەی رەگەیاندوە کە ( to be black ـ رەش بون ) رای دەگەیەنێ ، هیچ رەنگێکی تر وەیا کەیفیەتێکی تر وەیا حاڵەتیکی تر وەیا نیشانەیێکی‌تری پەیدا نەکردوە ، لێشی داوا ناکرێ پەیدایان کات . لێرە بە پێشەوە گوتمان سوفیکسی (ێ) دەچێتە سەر صفە ، بەمەدا دەزانین لە چاو سوفیکسی‌تری وەك (ایی ، ایەتی) سوفیکێکی بێ‌هێزە چونکە صفە خۆی لە مادیەتدا بێ هێزە . زۆر جۆرێ واتاکانیش لە زۆر جۆرێ ئەو وشانەوە دێت کە دەبنە ئەبستراکت نەك لە هەناوی سوفیکسەوە هەڵدەقوڵێن .

لە کوردیدا پاشگری‌تر هەیە کەلێك چالاکترە لەم سوفیکسەی (ێ) ئەبستراکت لەو روەوە هەرجارە رۆڵێك دەبینێت وەك پاشگری (ە) کە لەم نمونانەدا دەدیترێت :

| | |
|---|---|
| چاك : چاکە | |
| درێژ : درێژە | لێرەدا وشەکان بونە ئەبستراکت |
| کورت : کورتە | |

ناوناوە :
جارجارە : } وشەکەی کردە ئاوەڵکار ، adverb

سەر : سەرە
دەست : دەستە } وشەکەی کردە ئاوەڵناو ، صفە

سەرەژن ، دەستەکچ

خورپە :
تەقە : ناوی دەنگی دروست کرد
گرمە :

خول : خولخولە ناوی ئەمرازە (اسم الآلة) لە خولانەوەوە

مژ : مژمژە ناوی بەرکارە (اسم المفعول) لە مشتنەوە

سەر : سەرە
بن : بنە } ناوی جێگەن . دەگوترێ گای سەرە ، گای بنە

ئەم پاشگرە واتای تریش دروست دەکات کە پێی ناوی لێرەدا چی تری بەدوا کەوێ . رەنگە هەندێك لەم رێژانە لە مێژوودا شکڵی تریان بووبێت ، من چی بەرچاوە لە ئاخاوتنی ئێستاکەدا ئەوە دەڵێمەوە . وەك دەشبینی پاشگرەکە بە هۆی خودی خۆیەوە واتاگۆڕی دەکات چونکە هەر جارە وشە بەلایەکدا دەشکێنێتەوە ، وەك (ی) ئەبستراکت نیە کە هەر واتای تجریدی دروست کات .

بەدوا ئەم تێبینیانەدا یەکێکی تر دێت : ئوسەر کە واتای ئەبستراکت شی دەکاتەوە خوێنەرانی گۆڤارەکە دەباتەوە بۆ مەکتەبی

سەرەتایی و بەدیهییەیان تێدەگەیەنێ بە نمونەی هەمەچەشنە و بەوەدا کە دەڵێ باخەوان دەبینین و دەستی لێ دەدەین نەك باخەوانی . ئـەم شێوازەشـی بە درێژایی گوتارەکەی بەکار هێنـــاوە . عەرەبەکان لە کۆنەوە تەعریفی واتای تجریدییان کردوە بەوەدا کە گوتویانە (معنی یقوم بغیره) . وا باش بۆ تۆسەریش تەعریفێکی وەهای دۆزیبایەوە کە بەڕاستی تەعریف بێت نەك ژماردنی ئەو واتایانەی کە دروست دەبن لە تجریددا بکا بە تەعریف . لەمەش گەڕێین ، دەبێ ئەوە بزانین لە کوردیدا ، وەك لە موناسەبەدا گوتومە ، پاشگری ئەبستراکتی (ایی) واتای وشە بەرەو تحدید و هەست پێکردنیــش دەبات . کە گوتت (تیژایی دەرمانەکەم بۆن کرد) ئـەم هەست کردنەت زۆر بەهێزتر و مادی‌تره لەوە کە بڵێیی (جوانی دیمـەنەکەم دیت) تیژایی دەرمان بەرهەستترە لە جوانی دیمەن . واش‌دەزانم ئــــەم جودا کردنەوەیەی ئەبستراکت لە ئەبستراکت تایبەتییێـکی زمانی کوردی بێت چۆنـکە لەو زمانانەی شتێکیان لێ دەزانم جوداکردنەوەی ئەوتۆییم نەدیوە .

لە بارەی (قوتابێتی ، خوێڕێتی ، سەرسەرێتی ...) وە : لێرە بە پێشەوە گوتم ئەم بەکارهێنانە هی سلێمانی و ئەو شـوێنانەیە لەوەوە نزیکن ، زوربەی کورد بە هۆی پاشگری (ەتی)یەوە ئەبستراکتیان لێ وەردەگرێت و دەڵێت (قوتابیەتی ، خوێڕیەتی ، سەرسەریەتی ..) . بەڵام دەبێ بڵێمەوە لەم ڕێژەیەدا سوك کردنێك هاتۆتە ناوەوە چونکە دەبێ بگوترێ (قوتابییەتی ، خوێڕییەتی ، سەرسەرییەتی ..) بە پێی

دستوری شکاندنەوەی (ی) کە پێی دەڵێن (پێی نێو). نوسەر لێرەدا بە تەواوی ناوچە دۆستی خۆی دەربڕیوە ، وەیا خود بەمەدا لێی بەدیار کەوتوە کە گوێی‌یستی زۆرینەی شێوە ئاخاوتنی کوردی نەبوە . بە هەمە حاڵ (قوتابێتی) و وشەی وەك ئەو هەڵەیێکی سادەی پێ دەمەتەقەیە ئەگەر بە رێژەی رەسەن (قوتابییەتی) بگیرێت .

[ نرخێنەر ]

دروست کردنی ناوی ئەبستراکتی

لە وشەی ئاسان

أ ـ سوفیکسی (ی) لە ناوی ئاسان ناوی ئەبستراکتی دروست دەکات وەك :

١ـ برا + یی > برایی
٢ـ منداڵ + ی > منداڵی
٣ـ جۆلاّ + یی > جۆلاّیی
٤ـ بەنا + یی > بەنایی
٥ـ شایەن + ی > شایەنی
٦ـ هەتیو + ی > هەتیوی
٧ـ حەماڵ + ی > حەماڵی

هەروەها : شاعیری ، پزیشکی ، خەیاتی ، بەقاڵی ، هەلاجی .. هتد

ب ـ سوفیکسی (ی) دەچێتە سەر سیفەت و ناوی ئەبستراکتی لێ دروست دەکات وەك :

١ـ پیر + ی > پیری

٢ـ درێژ + ی > درێژی

٣ـ پان + ی > پانی

٤ـ تەنك + ی > تەنکی

٥ـ راست + ی > راستی

٦ـ تاڵ + ی > تاڵی

٧ـ خۆش + ی > خۆشی

٨ـ بلیمەت + ی > بلیمەتی

٩ـ گەنج + ی > گەنجی

١٠ـ جوان + ی > جوانی

هەروەها : تاریکی ، رۆناکی ، ئەستوری ، وشکی ، ئازادی ، رزگاری ، شێتی . هەژاری ، شارەزایی ، شادی ، پەستی ، توندی ، چەوری ، تۆزەبی ، کەری ، لاڵی ، کوێری ، شەلی ، نەگبەتی ، بەرزی ، نزمی ... هتد

[ رەخنە :

نوسەر لێم بسەلمێنێ کە دەڵێم چوار بەشی ئەم هەموو نمونانە بێ لزومە ، هەروەهاش دەبێ بزانین هەمو وشەکان یاصفەتن وەیا خود وەك صفەتن . (منداڵ) ئەگەرچی بە مرۆڤی نەوباو دەگوترێ ، بەڵام لە هەمان کاتدا دەکرێ بە صفەت لە رستەدا وەك (دارای منداڵ زیرەکترە لە دارای پیاو .) ناوی پیشەش (بەقاڵ ، دارتاش ، خەیات ،

قەساب ) هـەمویان وەصفین . بەمەدا دەردەکەوێ سوفیکسی ( ی ) هەر بە وشەی نەرم و بێ هێز دەوێرێت .

وشـەی ( نگبەتی ) کە لە ( نـکبەت )ەوە هاتوە بە مجاز لەکار هێنراوە چونکە ( نەگبەت ـ نـکبة ) خۆی ئەبسـتراکتە بەڵام کورد بە سەهو لە جێی ناوی مادی داناوە .

[ نرخێنەر ]

## دروسـت کردنی ناوی ئەبستراکتی
## لە وشـەی بارگران

أ ـ سوفیکسی ( ی ) دەچێتە سەر ئەو وشانەی کە لە ( پرێفیکس + وشە ) پێك هاتون وە دەیانکات بە ناوی ئەبستراکتی وەك :

١ـ بێشانس + ی > بێشانسی

هەروەها : بێ هێزی ، بێ عاری ، بێ دەنگی ، بێ خەوی ، بێکاری . . هتد

٢ـ نەمر + ی > نەمری

٣ـ ناچار + ی > ناچاری

هەروەها : ناخۆشی ، ناشیرینی ، نازەزایی ، ناپاکی

ب ـ سوفیکسی ( ی ) دەچێتە سەر ئەو وشانەی کە لە ( وشە + سوفیکس ) پێك هـاتون وە دەیانکات بە ناوی ئەبستراکتی وەك :

١ـ وشە + وان + ی

باخەوان + ی > باخەوانی

هەروەها : کە شتیوانی ، ئاشەوانی ، گاوانی ، مەلەوانی ، پاسەوانی ، زمانەوانی ... هتد

٢ـ وشە + گەر + ی

ئاسنگەر + ی > ئاسنگەری

هەروەها : مسگەری ، کیمیاگەری ، زەڕەنگەری ، شۆشەگەری ، چەقۆگەری ... هتد

٣ـ وشە + کەر + ی

نانکەر + ی > نانکەری

هەروەها : کارەکەری ، چێشتکەری ، نۆکەری ... هتد

٤ـ وشە + کار + ی

تاوانکار + ی > تاوانکاری

هەروەها : کرێکاری ، گوناهکاری ، رەخنەکاری ، خراپەکاری ، گەچکاری ، سپیکاری ، قوڕکاری ...(*)

---

(*) لە زمانی کوردیدا ئەم وشانە : ( گەچکار ، خراپەکار ، سپیکار ، قوڕکار ) ، بە شێوەیەکی گشتی وەکو وشەیەکی سەربەخۆ ، وانە بێ سوفیکسی ( ی ) بەکار نایەن .

[ دەگوترێ « خراپەکار » . نرخێنەر ]

٥ـ وشە + باز + ی

فێڵباز + ی > فێڵبازی

هەروەها : چەنەبازی ، ساختەبازی ، کەڵەکبازی ، قوماربازی ، کەڵەشێربازی ، ئاگربازی ، رمبازی ، کەوبازی ، سەگبازی .

٦ـ وشە + مەند + ی

دەوڵەمەند + ی > دەوڵەمەندی

هەروەها : هونەرمەندی ، ئارەزۆمەندی ، زەرەرمەندی .

٧ ـ وشە + وا + ی

نانەوا + ی > نانەوایی

هەروەها : پێشەوایی

٨ ـ وشە + وەر + ی

بیرەوەر + ی > بیرەوەری(*)

هەروەها : بەختەوەری ، هەڵەوەری ، دەمەوەری

٩ ـ وشە + دار + ی

بەشدار + ی > بەشداری

هەروەها : زۆرداری ، دڵداری ، میوانداری ، ئاگاداری ...

١٠ـ وشە + یار + ی

جوتیار + ی > جوتیاری

(*) وشەی ( بیرەوەر ) ئێستا بە شێوەیەکی لەتی بە تەنها بەکارنایەت .

هەروەها : بەختیاری ، زانیاری ، ئەندازیاری ... هتد

پ ـ سوفیکسی ( ی ) دەچێتە سەر ئەو وشانەی کە لە (وشە + رەگی کاتی رابوردوی فیعل ) پێك هاتون وە دەیان کات بە ناوی ئەبستراکتی وەك :

سەربەست + ی > سەربەستی [ بەست : رەگی کاتی رابوردوی فیعلی ( بەستن )ە ] .

رەگەز پەرست + ی > رەگەز پەرستی [ پەرست : رەگی کاتی رابوردوی فیعلی ( پەرستن )ە ]

ت ـ سوفیکسی ( ی ) دەچێتە سەر ئەو وشانەی کە لە (وشە + رەگی کاتی ئێستای فیعل ) پێك هاتون وە دەیان کات بە ناوی ئەبستراکتی وەك :

١ ـ دارتاش + ی > دارتاشی [ تاش : رەگی کاتی ئێستای فیعلی ( تاشین )ە ]

٢ ـ کتێب فرۆش + ی > کتێب فرۆشی [ فرۆش : رەگی کاتی ئێستای فیعلی ( فرۆشتن )ە ]

هەروەها : کوتاڵ فرۆشی ، سەوزە فرۆشی ، خۆفرۆشی ..هتد

٣ ـ رۆژنامەنوس + ی > رۆژنامەنوسی [ نوس : رەگی کاتی ئێستای فیعلی ( نوسین )ە ]

هەروەها : کەوش درویی ، لێفە درویی ، دەست بڕی ،

کوردناسی ، ئێرانناسی ... هتد

ج - سوفیکسی ( ی ) دەچێتە سەر ئەو وشانەی کە لە ( ناو + سیفەت ) پێکهاتون و دەیانکات بە ناوی ئەبستراکتی وەك :

دڵتەنگ + ی > دڵتەنگی

هەروەها : زمانلوسی ، زمانشیرینی ، خوێن گەرمی ، لوتبەرزی ، سەربەرزی ، سەرشۆڕی ... هتد

چ - سوفیکسی ( ی ) دەچێتە سەر ئەو وشانەی کە لە( دوو ناو ) پێکهاتونو دەیانکات بە ناوی ئەبستراکتی وەك :

دڵسۆز + ی > دڵسۆزی

مامۆستا + ی > مامۆستایی

ح - سوفیکسی ( ی ) دەچێتە سەر ئەو وشانەی کە بارگرانن و لە سێ وشەی جیاواز جیاواز پێك هاتون و دەیانکات بە ناوی ئەبستراکتی وەك :

سەربەخۆ + ی > سەربەخۆیی

بەرچاوتێر + ی > بەرچاوتێری

خ - سوفیکسی ( ی ) دەچێتە سەر ئەو سیفەتە بارگرانانەی کە لە دوو وشەی جیاواز و بە یارمەتی ئەداتی پەیوەندی ( و ) پێك هاتون ، ئەم جۆرە سیفەتانە جاری وا هەیە لە دوو وشە پێك دێن کە تەنها وشەیەکیان لەو دوو وشەیە بە تەنها بەکار دێت و

سەربەخۆیە ، بـــەڵام وشەکەی تریان بە تەنها بەکار نایەت و
ماناشی بە تەنها نییە .

بۆنموونە :

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| کورچ وکۆڵ | + | ی | > | کورچ وکۆڵی |
| تۆزەوتـــۆز | + | ی | > | تۆزەوی |
| کەم وکوڕ(*) | + | ی | > | کەم وکوڕی |
| پاک وتەمیز | + | ی | > | پاک وتەمیزی |

[ رەخنە

لەم نمایشتەی نموونانەدا لەخۆمەوە گەڵێک رستەم رەش کردەوە ، لەو رستانەی کە وشەی نموونەکانی تێدا بەکار هاتوە ، وەک ئەوەی کە بۆ روون کردنەوەی وشەی ( دارتاشی ) نووســـرابوو ( داری گوێز بە نرخە ، جوانە بۆ ئیشــــی دارتاشی ) . بڕوا دەکەم کەس نیە گۆڤاری کۆڕ بخوێنێتەوە و پێویستی بەم روون کردنەوەیە هەبێ بۆ تێـگەیشتنی واتای ( دارتاشی ) . من بە ئازادیتەیی ئەم کارە سەربەخۆیەم کرد .
نرخێنەر ]

---

(*) وشەی ( کەم وکوڕ ) ئێستا لە زمانی کوردیدا وەک وشەیەکی سەربەخۆ بێ سوفیکسی ( ی ) بەکارنایەت .
[ بە پێچەوانە ، خەڵق بەکاری دێنن و دەڵێن دنیا کەم وکوڕە .
نرخێنەر ]

هەروەها سوفیکسی ( ی ) دەچێتە سەر کۆمەڵی‌تر لە وشەی جیاواز جیاواز .

ئەو ناوە ئەبستراکتیانەی کە بە یارمەتی سوفیکسی ( ی î ) پێك هاتون ، وەك لە سەرەتاوە وتمان یان حاڵەتێك پێشان دەدەن وەك : هەژاری ، پیری ، خۆشی گەنجی .. هتد ، یاخود خاسیەتی شتێك و نیشانەی شتێك پێشان دەدەن وەك ئەستوری ، نەرمی ... هتد ، یان ناوی کارێك و جیا کردنەوەی جۆری ئەو کارە لە کارەکانی‌تر پێشان دەدەن وەك : مامۆستایی ، جۆلایی ، جوتیاری ، ئاسنگەری ، یا جۆری شتێك پێشان دەدەن وەك چاکی ، قایمی ...هتد .

بەم جۆرە بۆمان دەرکەوت کە سوفیکسی ( ی î ) کە بە ئەسڵ دەچێتەوە سەر سوفیکسی ئێرانی کۆن ( ئیه îh ) چ رۆڵێکی گەورە لە مەیدانی وشەسازی لە زمانی کوردیدا دەبینێت .

[ رەخنە :

سەرلەبەری رایەکانی نوسەر کە لە ژێر سەرەباسی ( دروست کردنی ناوی ئەبستراکتی لە وشەی بارگران )دا هاتوە جێی رەخنە لێ‌گرتن وەیا ساغ کردنەوە وەیا رۆن کردنەوەیە ، بەڕاستی ناتوانم بە درێژی لە بارەی هەمو سەروبەرێکی ئەو رایانە بنوسم ، رەنگە گۆڤارەکەش ئەم هەمو درێژیەی پێ خۆش نەبێت وا لەم چەند خاڵەدا رەخنەکانم کۆ دەکەمەوە :

یەکەم : لیستەی نمونەکان یەکجار لە پێویست پترە. وەك من لە باسەکە بکەم کە گوترا و زانرا سوفیکس (ی) دەچێتە دوای وشەی (وصفی)یەوە ئیتر هەرچی وصفی بێت بەر ئەم گوتەیە دەکەوێت ، ئەوساش لزوم نامێنێ وشەکانی (نەمر ، ناچار ، بێشانس ...) جودا بکرێنەوە لە (باخەوان ، پاســـەوان ..)وەیا (تاوانـکار ، کرێکار ، گوناهکار ...)وەیا (ئاسنگەر ، زێڕنگەر ...) وەیا (نانکەر ،کارەکەر...) وەیا (فیڵباز ، تەقڵەباز ...) وەیا (دەوڵەمەند ، ســودمەند ...) وەیا (نانەوا ، پێشەوا) وەیا (بیرەوەر ، بەختەوەر ، بەهــرەوەر ...) وەیا (بەشدار ، زۆردار ، دڵدار ..) وەیا (جوتیار ، بەختیــار ...) و لیستەی تایبەتییان بۆ رێك بخرێت : ئەمانە هەمویان وصفــن بۆیــە سوفیکسی (ی) چۆتە دوایانەوە . ریز کردنی ئەم لیستانە بنیچــەی دەستورەکە دەشارێتەوە کە لەسەر (وصفية) هەڵچەقیوە . ئەمە فەرقی نیە لەگەڵ ئەوەدا بە شان و باهوی (خواردن) هــەڵ بڵێی بەوەدا کە جارێــکیان لەگەڵ شتی شل ، جارێــکیان لەگەڵ شــتی رەق ، جارێکیان لەگەڵ شتی خەیاڵیدا بەکاری بێنیت و بڵێی چەند بایەخدار و بەرهەمدارە (شۆرباى خوارد ـ خەفەتی خوارد ـ پڵاوی خــوارد ـ بەرتیلی خوارد ـ ســـەندانی خوارد ـ سوێندی خوارد ـ زۆری خوارد ـ تێری خوارد ...) هەر جارەش لیستە بۆ نمونەکان رێك خەیت .

دوەم : وشەکانی (نانکەر ،کارەکەر ...) لەگەڵ ئەوانەی کە گۆیا لە رەگی کاتی رابردوی فیعل پێك هاتون وەك (سەربەست ، رەگەز

پەرست ...) هەروەها ئەوانەی گوایا لە رەگی کاتی ئێستای فیعل پێك هاتوون وەك (دارتاش ، کتێب فرۆش ...) ئەمانە تێکرایان ناوی کارای لێکدراو (اسم فاعل مرکب)ن هەموشیان صفەتن هەرگیز لە یەکتر جودا ناکرێنەوە ، هاتنیشیان لە رەگی کارەوە وەیا چاوگەوە لە یەکتریان بێگانە ناکات ... صیغەی (نانکەر) فەرقی نیە لەگەڵ (ناندەر ، رێکخەر ، دارتاش ، نامەنوس ..) لە روی رێزمانەوە ، تەنها لێرەدا شتێکی گرنگ هەیە دیارە لە نوسەری گوتارەوە بزرە : ئەم صیغەیەی اسم فاعل مرکب کە لە هەندێ فعل وەردەگیرێت بە پێی (شاذ) بونی فعلەکە ئەویش (شاذ) دەبێت واتە قاعدەی بۆ دانارێ بزانرێ لە چ سەرچاوەیێکەوە وەردەگیرێت . بە نمونە فعلەکانی (خواردن ، کردن ، بیستن ، دان ، نان ، گوتن ...) تصریفیان شاذە لەسەر دەستور نارۆات ، (خواردن) دەبو وەك (بواردن) تصریف بکرێ کە دەستوریە بەلام شاذە و لە مضارعدا دەبێتە دەخۆم کە دەزانین (بواردن ، سپاردن ، هەناردن ، شاردنەوە) هتاد .. هەمویان دەبنە (دەبوێرم ، دەسپێرم ، دەنێرم - دەهەنێرم - دەشێرمەوە ...) . اسم فاعیلی ئەمانە هەموی دەستوریە (رۆژبوێر ، گیانسپێر ، پیاوهەنێر ، خۆشێرەوە ... ) کەچی دەڵێی (نان خۆر - ناڵێی نان خوێر) .

(تاشین) وەك (زانین ، ناسین ، هەڵپاچین ، هەڵواسین ...) هەموبان دەستورین دەبنە (دارتاش ، زۆر زان ، سەرناس ، لکدار

هەڵباج ، گوشت هەڵواس ...) .

(پێوان ، کێشـــان ، پێـکان ، کێڵان .) ئەم وەزنەش دەســـتوورییە هەرچەند وا دەبێ شـــاذی تێدەکەوێ ، وەك زۆر وەزنی‌تر ، اسـم فاعل مرکبیان (ئاردپێو ، ئاوکێش ، نیشانپێك ، زەوی‌کێڵ ...) هەموو فیعلەکانی (ـ اندن) یش دەستوورین .

شتی‌تریش هەن بگوترێن من بە دوای ناکەوم .

ئەم صیغانە لەوەی دەستوورییە و ئەوەی بیژۆك (شاذ)ە هەموی وەصفن ، دیارە سوفیکسی (ی) دێتە دوایانەوە چ لیستە رێك خستنیشی ناوێ . ئەگەر بمانەوێ دەتوانین بڵێین صیغەی اسم مفعول مرکبیش (ناوی بەکاری لێـکدراو) دەبێ لیستەی بۆ بگیرێ وەك (کوڕکوژراوی ، ماڵ دزراوی ، ماف خوراوی ....) .

وشەی لێـکدراوی وەك (دەست لەســـەر سنگ ، چنگ لەسەر شان ، پیاوانە ، ژنانە) سوفیکسی (ی) قبول ناکەن چونکە لە راسـتیدا ئەمانە (ئاوەڵـکار ـ adverb)ن هەرچەند وصفیەتیشیان تێدایە ، بەمەدا دیارە (ی) سوفیکسێـکی (ناوی) نەك (کاری)یە .

کورتەی قســە ئەمەیە داڕشتنی (اسم فاعل مرکب) بەم شێوە گشتییە ناخرێتە بەر دەستووری (رەگی ئێستای فعل ، رەگی رابوردوی فعل)ەوە : دەبێ فعلە بیژۆك ـ ریزبەڕ ـ ەکان جـــودا بکرێنەوە و بە پێی لوان و توانا ســـەرەدەریـان لێ بکرێ ، ئـەوانی دەستووریشن بە فرەوانی و لە راستە شەقامەوە رێژەکانیان باس بکرێ .

دوان له بارەی رەگی فیعلی رابردوو و ئیستاوەش وەها به سادەیی نابێ . دەزانم زمانەوانانی کورد تێکڕا وەیا زوربەیان رواڵەتی صیغەی فعلەکە دادەنێن به (رەگ) هەریەکەشیان له ناوچەی خۆی رازییه و دەیکا به نموونەی رێزمانی رەسەن : ئەمە خەیاڵێکە زۆر ساکار و هەژار .. بەداخەوە ناتوانم لەسەری بڕۆم .

(بەستن ، پەرستن ، درووَن) رەگی رابردوو و ئیستایان یەکێکە .

هەرچی فعلی یائی و ئەلفی هەیە له مضارعدا ئەلفەکە و یێیەکان دەڕوات با فعلەکان دەستوریش بن ، تەنها فعلی (روودان ـ مطاوع) و فعلی (مبنی للمجهول ـکاری کارابزر) ئەلفەکەی رابردوویان دەبێتە (ێ) له مضارعـدا .. ئەمانە بەدیهیاتن و ج دەخلیـان بەسـەر هاتنی (ت) نیسبەتەوە نیه دەبێ له ژێر عنوانێکی‌تردا باس بکرێن .

سێیەم : دەبێ بەهەمەحاڵ سەرلەبەری (وشه + کەر + تی) راگوێزێ بۆ ریزی (پ ، ت) له ریزی نموونەکان که رەگی فعل باس دەکات وەك (سەربەست ، رەگەز پەرست ، دارتاش ، کتێب فروش) چونکە ئەم رەگەی (کەر) که پاشماوەی (کردن)ە کەرتە فیعلییەکەی اسم فاعل مرکبە وەك ئەوانی‌تر ، ج بایەخێکیش بەوە نادرێ که ئەم (کەر)ە له رواڵەتی ئێســتاکەی‌دا نه بەر رابردوو نه بـــەر ئێستاکە دەکەوێ ، گرنگ ئەوەیە کەرتی فعلە وەك (بەست ، تاش ، فرۆش) . وەك ئەمیش کەرتی (دان ، نان ، کوشتن ...) کەدەبێتە (دەر ، نەر ، کوژ ...) جا بەر رابردوو وەیا ئێسـتا بکەون یاخود بـە جارێ

ریزپەڕ - بیۆڵۆك - بن بابین فەرق ناکا .

چارەم : وشەی (زانیاری) قیاسی لە (بەختیاری ، جوتیاری ..) ناکرێت چونکە (زانیار) کە لە (زانین)ەوە هاتوە بە ئەصل دەنگی (ی) تێدایە ، لەبەر ئەمە دەشێ وشەکە لە (زانی + ار) هاتبێ وەك (کرد + ار = کردار ، گوت + ار = گوتار) ئەویش ، واتە زانیاریش ، (اسم مصدر) بێت بە واتای (معرفە) نەك (اسم فاعل) بێ بەواتای (عالم) . کەواتە ئەو (ی) کە دەکەوێتـە کۆتایی (زانیـار)ەوە و دەیکاتە (زانیـــاری) سوفیکسی نیـسـبەت دەبێ نەك سوفیکسی ئەبستراکت ، چونـکە (زانیـــار) کە بە واتـای (معرفة) یە خۆی ئەبستراکتە . سەیری (دزیاری) بکە ئەویش کە لە وشەی (دزین)ەوە هاتوە بە رێبازی (اسم مصدر)دا هاتوە نەك (اسم فاعل) چونکە(دزیاری) هەرگیز فاعل نیە : ماڵی (دزیاری) ئەو ماڵەیە دزراوە نەك ئەو کەسەیە کە دزیوەتی . (بژیار) ئەویش وەك (زانیار ، دزیار) ناوی چاوگە لە( بژین)ەوە هاتوە [ بژی + ار = بژیار ] . لەم وشانەی کە بە رواڵەت کۆتاییان بە (یار) دێت تەنها وشەی (کڕیار) اسم فاعلە و بە ئەصلیش دەنگی (ی) لە فعلەکەدا هـــەیە ئەویـش زۆر ئاشکرایە کە وا لە پەنا (فرۆشیار)ەوە خۆی خزاندۆتە تاقی اسم فاعلەوە : فرۆشـــیار اسم فاعلە چونکە سەرلەبەری (یار)ی لێ زیاد کراوە . فرۆشتن (ی) ئەسلی تێدا نیە .

ئەم باسەی (زانیار - زانیاری) لە گوتارێـکی خۆمدا روون

کراوەتەوە کە لە سەرەتاکانی دامەزرانی کۆڕ لە ژمارەیێکی گۆڤاری (زانیاری)دا لە ژێر ناونیشانی (کۆڕی زانیاری کورد چۆن ئەم ناوەی وەرگرت) بڵاو کرایەوە .

٥- سوفیکسی (ی) کەسی (دارتاشی) لە کەسی (جۆڵایی) جودا نەکردۆتەوە : جۆڵا خۆی لە دارتاش جودا بۆتەوە . هەروەهاش بە نیسبەت (هەژار و پیر - ئەستور و نەرم - چاك و قایم ...)ەوە ، وشەکان حاڵەت و خاسیەت و ... هتد نیشان دەدەن .

[ نرخێنەر ]

چۆنێتی دروست کردنی سیفەتی نیسبی بە یارمەتی
سوفیکسی (ی ī) لە زمانی کوردیدا .

لە زمانی کوردیدا بە یارمەتی سوفیکسی (ی) کە بەئەسڵ دەچێتەوە سەر سوفیکسی ئێرانی کۆن (ئیك īk) ، ژمارەیەکی زۆر لە سیفەتی نیسبی دروست دەکرێت ، ئەم سوفیکسەش وەك سوفیکسی (ی) کە ناوی ئەبستراکتی دروست دەکات دەچێتە سەر ئەو وشانەی کە ئەسلیان کوردین ، هەروەها دەچێتە سەر ئەو وشانەش کە ئەسلێان کوردی نین .

ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە کە ئەم سوفیکسی (ی)یە وەکو لە ئەنجامی ئەم لێکۆڵینەوەماندا بۆمان دەرکەوت ، سوفیکسێکی رەسەنی ئێرانییە . سوفیکسی (ی) ئەگەر هاتو چوە سەر وشەیەك و مەبەست لە کەسێك بێ ئەوا لێرەدا ئەو وشەیەی کە سوفیکسی (ی) چۆتە سەر دەبێت بە ناوێکی نیسبی بۆ نمونە : وشەی (بەغدا)

ئەگەر هاتو سوفیکسی (ی) چوە سەر : بەغدا + ی > بەغدایی ئەوا وشەی (بەغدایی) ئەگەر مەبەست لە کەسێك بێت کە خەڵکی شاری بەغدا بێت ناوێکی نیسبییە ، بەڵام ئەگەر هاتو مەبەست لە شتێك بۆ ئەوا سیفەتی نیسبییە .

[ رەخنە :

وشەی (بەغدایی) خۆی لە خۆیدا سیفەتێکی نیسبییە ، چ فەرقێکیش نیە لەوەدا پیاوێك بەغدایی بێت وەیا شەربەی گاو بەغدایی بێت . کاتێك (بەغدایی) دەبێتە ناو کە بکرێ بە (اسم علم) بۆ یەکێکی دیار کراو ، لێرەشدا فەرق نیە ناوەکە بۆ (شێرێکی باغچەی جانەوەران) بێت یاخود بۆ (کابرایێکی گەزەکی جدید حسن پاشا) بێت . کەواتە راست نیە بڵێین وشەی (بەغدایی) کە بۆ مروف بۆ دەبێتە ناوی نیسبی . لە رستەی (کابرایێکی بەغدایی مەلەی کرد) وشەی (بەغدایی) سیفەتە هەرچەند بۆ کەسێکیش بەکار هاتوە کە دانیشتوی بەغدایە . بە پێچەوانە ، کە کەڵەشێریکت هەبێ ناوی (بەغدایی) بێ ئەوسا وشەکە لە سیفەت دەشۆرێ و دەبێتە (اسم علم Proper Noun) هەرچەند کەڵەشێر کەسیش نیە .

(اسم علم) لە هەمو جۆرە وشەیێك دروست دەکرێت ، تەنانەت وا دەبێ رستەی سەرلەبەر دەبێ بە ناوی عەلەم وەك (خوا دای ، تأبّط شرا ، جاد الله ..) . کورد بە جنۆکە دەڵێ (لەمەچێتر ـ واتە

له لێمه چاکتر ) بۆ ئەوەی ئاسیبی دوّر خانەوە .

نرخێنەر ]

ئەگەر هاتو وشەیەك کۆتایی بە حەرفێکی دەنگدار هات ئەوا حەرفی ( ی y ) کە حەرفێکی بێدەنگە دەچێتە نێوان ئەو حەرفە دەنگدارە و سوفیکسی ( ێ î )یەوە بۆ نموونە :

| وشه | حەرفی ( ی y ) بێ دەنگ | سوفیکسی ( ێ ) | سیفەتی نیسبی |
|---|---|---|---|
| حەفتە | ی | ێ | حەفتەیی |
| مێژوو | ی | ێ | مێژوویی |
| بەغدا | ی | ێ | بەغدایی |
| سنە | ی | ێ | سنەیی |

ئەگەر وشەیەك کۆتایی بە حەرفی ( ی ) دەنگدار هات ، ئەوا ئــەو حەرفی یای دەنگدارە لەگەڵ سوفیکسی ( ێ ) لە یەك دەدەن وەك : سلێمانی ، کەراچی .

یەکێك لە خەسیەتە تایبەتێکانی سوفیـکسی ( ێ î ) وەکو لەمەوپێشیش وتمان ، ئەوەیە کە هەندێ جار لە رستەدا فڕێ دەدرێت ، بەڵام بەبێ ئەوەی فڕێ دانەکەی کار بکاتە سەر مانای رستەکە .

سوفیکسی ( ێ ) دەچێتە سەر وشـــەی ئاسان و بارگران و دەیانکات بە سیفەتی نیسبی .

## دروست کردنی سیفەتی نیسبی لە وشەی ئاسان و بارگران

زستان + ی > زستانی

هەفتە + ی > هەفتەیی

ئەدەب + ی > ئەدەبی

گشت + ی > گشتی

جیهان + ی > جیهانی

مێژوو + ی > مێژوویی

نیشتیمان + ی > نیشتیمانی

ئاین + ی > ئاینی

فۆلکلۆر + ی > فۆلکلۆری

قاوە + ی > قاوەیی

زەیتون + ی > زەیتونی

هەروەها : شەرابی ، رەساسی ، شەکری ، پرتەقاڵی ، زیوی ، ئاڵتونی ، خۆڵەمێشی .

خۆماڵ + ی > خۆماڵی

هەشتاساڵ + ی > هەشتاساڵی

سەدپەڵە + ی > سەدپەرەیی

دۆنهۆم + ی > دۆنهۆمی

سەرەتا + ی > سەرەتایی

سەرەك + ی > سەرەکی

ئەوروپا + ی > ئەوروپایی

کورد + ی > کوردی

هەولێر + ی > هەولێری

پشدەر + ی > پشدەری

[ رەخنە :

ئەم هەمو شریتە دوور و درێژەی نمونانی بۆ روون کردنەوەی تاکە یەك دەستوری بنچی دە جاران لە پێویست پترە . تەنها خاڵێکی زۆر گرنگ هەبێ لە ناو نمونەکاندا کە دەبێ باس بکرێ هەڵ بوێراوە خاڵەکەش ئەمەیە ، وەك پێشتریش گوتومە ، نیسبەت بۆ ناوی میللەت و هۆز نایکا بە مرۆڤی ئەو میللەتە و هۆزە : کوردی و عەرەبی و بلباسی نابێتە مرۆڤی کورد و عەرەب و بلباس بەڵکو دەبێتە زمانی کوردی و عەرەب و زاری بلباسی . پشت گوێ خستنی ئەم راستییە زلە تێ‌نایەتەوە بەوەدا کە لیستەی نمونان بەدوا یەکتردا قەتار بکرێن ،

---

(*) وشەی ( خۆماڵ ) لەزمانی کوردیدا ئێستا وەك وشەیەکی سەربەخۆو بێ‌سوفیکسی ( ی ) بەکارنایەت .

جارێکیتریش رێم بە خۆم دا چەند دێڕی نموونەی وشان بسەڕمەوە چونکە وەك (تحصیل حاصل) وا بوون . رێکاری گۆڤارەکە دەبێ گەلێك بەرزتر بگیرێ لەوەی کتێبی رێزمانی پۆلی سێی ناوەندێ داخوازێ دەکات .

[ نرخێنەر ]

هەروەها : بە یارمەتی سوفیکسی ( ێ ) ژمارەیەکی زۆر لە ( ئەدڤێرب )(*) دروست دەکرێت پاش ئەوەی کە ( پێشپرتك )ی(**) ( بە ) دەچێتە پێش وشەکەوە وەك(***) :

بە + جوان ێ > بەجوانێ

بە + پاش ێ > بەپاشێ

بە + رێك وپێك + > بەرێك و پێکێ

---

(*) لە زمانی کوردیدا هەتا ئێستا زاراوەی ( زەرف ) بەکار هاتوە ، بەلای ئێمەوە وا باشترە کە زاراوەی ( ئەدڤێرب ) بەکار بێنین چونکە جیهانیترە . [ بە زۆری ئاوەڵکار بەکار دێت ـ نرخێنەر ]

(**) لە زمانی کوردیدا زۆر جار ( حەرفیجەر ) بەکار هاتوە ، بەلای ئێمەوە زاراوەی ( پێشپرتك ) زۆر راسترە و کوردی یەکێتی سوڤێت بەکاری دێنن .

[ پێشپرتك و Preposition دەوری ئەمرازەکان لە رستەدا دیار ناخەن ، حرفی جریش بۆ کوردێ دەست نادات ـ نرخێنەر ]

(***) لە بەر ئەوەی کە ئەم دیراسەیەمان تەنها بۆ باسی سوفیکسی ( ێ ) کە ناوی ئەبستراکتێ دروست دەکات لەگەڵ سوفیکسی ( ێ ) کە سیفەتی نیسبێ دروست دەکات تەرخان کردوە ناتوانین بەدرێژی باسی ( ئەدڤێرب ) بکەین .

وەکو دەبینین ئەم ئەدڤێربانە لە (پێشپرتك + وشـــە + سوفیکسی (ی) کە سیفەتی نیسبی دروست دەکات) دروست‌بوون .

ئەم ئەدڤێربانە وەڵامی پرسیاری (چۆن) دەدەنەوە بۆ نمونە :
چۆن کارەکەت کرد ؟ بە باشی کردم یاخود بە جوانی کردم .

[ رەخنــە :

نوسەری گوتار کە وشەکانی (جوانی ، باشی ، رێك‌وپێکی) لە ئەدڤێربی (بەجوانی ، بەرێك‌وپێـکی ، بەباشی )دا وا داناون کە وشەی نیسبین و (ی) کۆتاییان هی نیسبەتە ، هەڵەیێکی زۆر زلی‌کردوە . ئەمە یەکێکە لەو رەخنانەی بەپەلە لەنامەدا بۆم نوسیوە .

نەختێك لێ ورد بونەوە دەری دەخات کە ئەم وشانە (جوانی ، خۆشی ، رێك‌وپێکی ... ) لەم رێژەیەی ئاوەڵکاردا هەموویان ئەبستراکتن نەك نیسبەت ، ئەوەی وا دەکات زیهن بۆ لایەنی نیســـبەت بڕوات رواڵەتێـکی بێ‌هێزی رێـکەوتە چونکە ئەم نمونانە هەموویان صفەتن و بە هۆی (ی) دەبنە ئەبستراکت کە لە شـــێوەدا فەرقی نیە لەگەڵ (ی) نیسبی . (جوانی ـ بە واتای جمال) لەگەڵ (جوانی ـ بەواتای جیلیّ) شکڵیان یەك شتە . بەڵام با بێین ئەدڤێرب لەو ئەبستراکتانە دروســت کەین کە بە (ایەتی) پێك هاتون وەك (بەبرایەتی ، بە باوك و ئەولادەتی ، بە دوشمنایەتی ، بەکەرایەتی ـ بەکوێرایی چاوی دوشمن ... ) لەم نمونانەدا چ زیکی نەما لەگەڵ رواڵەتی صفەتی نیسبی بۆیە زیهن

لێیان ناخلیسكێ بۆ تصوری هەڵە و چەوت .

ئەوەندەی بیرم كردبێتەوە لەم ڕیزۆیەی ئاوەڵكار تەنها لە یەك شێوەدا دیتومە بە (ێ) نیسبەت پێك هاتبێت ، كە خاوەنی گوتار خۆی لێی نەداوە ، ئەویش وەك لەم نمونەیەدا دەر دەكەوێت :

بـــە كوردێ دەژیم بە كوردێ دەمرم

بـــە كوردێ دەدەم جـوابی قـەبرم

دیارە لێرەدا ئەم (ێ)ە هی نیسبەتە چونكە ڕیزۆی ئەبستراكتی ( كورد ) و ناوی هەمو میللەتێك (كوردایەتی ) و ڕیزۆی وەك ئەوە .

ڕیزۆیێكی تر هەیـــە جێی ئەمە دەگرێتەوە بەڵام پێوەندێ بە نیسبەت و ئەبستراكتەوە نیە وەك ( كوردانە ، ژیرانە ، پیـاوانە ... ) كە ئەمیش ئەدڤێربە .

لێرەدا تێبینی و رەخنەكانی منیش ، وەك گوتارەكە خـۆی ، كۆتاییان دێت . تكام ئەوەیە خاوەنی گوتار لێم دڵشكستە نەبێ بەو سەراحەتەی كە لە نوسینەكەمدا بەكارم هێنـاوە چونكە چی لێرەدا كراوە خواهشتی خۆی بوە . ئەم ناز راگرتنەش لەكۆڕ و لە منیشەوە دەربارەی خۆی و گوتارەكەی كە ئەركێـكی نەفەس‌بڕی داخوازێ كرد ، بەتایبەتی لە منەوە ، ناز راگرتنێكە كە كۆڕ لە ماسـت نوێنەرێكی خۆی لە وڵاتی دۆست‌خوای یەكیەتی سۆڤییێتدا دەیكات لـەو ڕوەوە خاوەنی گوتار لە لایەن كۆڕەوە لە سەر حیسابی ( زەماڵەت ) بۆ ڕوسیا

هه‌ناردراوه ، ئیستا وا به خۆشییه‌وه سه‌رەوژور چۆن و فراژۆ بۆنی دەبینینه‌وه .

[ مه‌سعود محه‌مه‌د ]

له ئه‌نجامی ئه‌م دیراســـه‌یه‌ماندا گه‌یشتینه ئه‌وه‌ی که توانیمان دیراسه‌یه‌کی مێژوویی دوو سوفیکس له زمانی کوردیدا بـکه‌ین ئه‌و دوو سوفیکسه‌ش که وه‌ك زانیان یه‌کێکیان سوفیـکسی ( ی î ) بۆ که ناوی ئه‌بستراکتی دروست ده‌کات ، ئه‌وی‌تریان سوفیکسی ( ی î ) بۆ که سیفه‌تی نیسبی دروست ده‌کات ، هه‌روه‌ها توانیشمان ئه‌سڵی هه‌ر یه‌کێك له‌م دوو سوفیکسه ساغ بکه‌ینه‌وه و له یه‌کتریمان جیا کردنه‌وه و رۆڵی تایبه‌تی هه‌ریه‌کێـکمـان له‌م دوو سوفیکسه که له مه‌یدانی وشه سازی له زمانی کوردیدا ده‌یبینن ده‌رخست .

هیواداریین که ئه‌م دیراسه‌یه‌مان سـوودێـکی بچوك به زمانی کوردی ببه‌خشێت وه سه‌ره‌تایه‌ك بێت بۆ دیراسه کردنی مێژوویی هه‌موو به‌شه‌کانی گرامانیـکی زمانی کوردی .

## ئاگادار کردنه‌وه

چه‌ند جار لێره به پێشه‌وه عوزرم بۆ کۆڕ و خوێنه‌رانیشـــی هێناوه‌ته‌وه له‌وه‌دا که پیتی (ی) کاتێك له نووسیندا که‌وته نێوان پیتانه‌وه وه یا به پیتی کوتایی وشه‌وه لـکا من ئه‌م نیشـــانه‌یه‌ی ســه‌ره‌وه‌ی بۆ دانانێم چونکه به‌داخه‌وه وه‌ها دارژراوه که وه‌ك دوو نوقته‌ی پیتی

( ت ) دەخوێنرێتەوە . هەر کاتێك ڤاڵبی پیتەکە گۆڕا بە یەکێکی تری خۆش خوێن دیارە منیش نیشانەکە دادەنێم . لەم گوتارەدا ئەوەی بەر توسینی خۆم کەوتوە ، بەدەگمەن نەبێ ، نیشانەی سەر (ڕ)کەی تێدا نادیترێ مەگەر بە جـــودا کەوتبێتە کۆتـایی وشـــەوە وەك (کوردێ ، وشە سازێ ..)

زرخێنەر

* * * *

# ملخص المقال

## صياغة الكلمة فى اللغة الكردية

فاروق عمر صديق

١ـ لاحقة ( ى ) التجريد

٢ـ لاحقة ( ى ) النسبة

للقال يفضي من مقدمة عامة في ظاهرة التوسع التعبيرى عن سبيل استعمال اللواحق وما شـاكلها ، إلى بحث الأصل التأريخي للاحقتى ( ياء التجريد و ياء النسبة ) في اللغة الـكردية وهما في صورتهما الحالية شيء واحد لا فرق في تهجئتهما وقد اظهر للقال ذهاب غالبية الباحثين في قواعد اللغة الـكردية الى اعتبارهما صوتاً واحداً يسـتعمل في معنيين مختلفين فتصدى لتفنيد ذلك باستعراض تأريخي لما كان عليه كل واحدة من اللاحقتين على عهد اللغة ( الفارسية الوسطى ) حين كانت لاحقة التجريد هي ( يه ) ولاحقة النسبة هي ( يك ) و كيف انهما تطورتا بعد ذلك في ( الفارسية الحديثة ) الى ( ى ) للنسبة و للتجريد معاً بفقد كل واحدة من الياءين للصوت الذي كان يأتي بعدها ( وهو صوت الهـاء فى ياء التجريد و صوت الـكاف في ياء النسبة ) وأن اللغه الـكردية باعتبارها

واحدة من لغات الأسرة الأيرانية خليقة أن تكون مثل الفارسية الحديثة قد مرت بالتطور نفسه الذي مرت به الفارسية من حيث اختزال صوتي الهاء والكاف في اللاحقتين الأصليتين وبقاء الياء وحدها عبر الزمن وقد اتى للمقال بالشواهد اللغوية على فقد كثير من مفردات اللغة الكرديه صوت الهاء و صوت الكاف في أواخرها بما يرفع الغرابة في اختفاء الهاء و الكاف بعد الياءين للبحوث عنهما في المقال .

مما يميز طريقة نشر هذا المقال في مجلة المجمع أنه مصحوب بنشر النقدات والملاحظات التي علق بها عليه الخبير الموكول إليه تقييم المقال ، ومرد ذلك الى ما كان من تخيير المجمع لصاحب المقال بين ان يعيد النظر فيه بالتعديل على ضوء اراء الخبير وبين أن ينشر المقال بنصه شريطة أن ينشر معه اراء الخبير فاختار الكاتب نشر بحثه دون ان يمس ويكون من شأن النقد ما يكون فكان ما كان على النحو الملحوظ . ولقد يكون من أسباب هذا التخيير هو أن كاتب المقال احد اربعة ارسلهم المجمع العلمي الكردي الى معاهد الأتحاد السوفيتي لأستكمال دراستهم العليا كل في مجاله وذلك ضمن خمس زمالات قدمها الأتحاد السوفيتي للمجمع قبل بضع سنين فليس عجباً ان يكون استقبال المجمع لباكورة أحد مبعوثيه في دولة صديقة مقترناً بحظ من المجاملة والتشجيع .

* * * *